رۆڤار

رۆژنامه - گۆڤار




# گوڵەکان بۆ محێدین زەنگنە

نیگاری: بەختیار مستەفا


مانگانەیەکی رۆشنبیری‌یەو هەر ژمارەی تایبەتە بە داهێنەرێك

دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم دەری دەکات

**دەستەی راوێژکاران**
حسین عارف
رەووف بیگەرد
ڕیبین ئەحمەد هەردی

**سەرپەرشتی گشتی**
شیرکۆ بیکەس

**بەڕێوەبەری رۆڤار**
دلشاد عبداللە

**کارگێر**
عوسم[illegible]

**سەرپەرشتی هونەری**
قادر میرخان

**مۆنتاژی کۆمپیوتەر**
کاوە حسین محمد

6
24/4 /2000

# لەنێوان باخەکانی پرتەقاڵدا

کەمن ئەو کەسە بەهرەمەندانەی تۆ بتەوێت وەك کەسایەتیان باسی دەوڵەمەندو بەبڕشتیان لەسەر بنوسیت –چونکە شایانی ئەو نووسینەن و کەچی تەمەنی هاوڕێیەتی‌و پێڵەوە ژیانتان لەوە کەمتر بووبێت کە یادەوەرییەکانی منالیتان، قوتابییەتی، کارکردن، ئایدۆلۆژیایەکی دیاریکراو بۆ ساڵانێکی دوور پێکیەوە بەستبێ. مەبەستم لەنووسینی رەخنەو لێکۆڵینەوە و هەڵسەنگاندنی ئەدەبی‌و هونەری‌و داهێنانی ئەو کەسە نیە، بەڵکو مەبەستم لەو جۆرە نوسینەیە کە تەنیا هەڵوێستەیەکی راگوزاری و ئەرکێکی وەفاداری و هەستێکی بەکوڵو دڵی رووت بێت بۆ خودی ئەو کەسە.

*لە دوا ساڵانی حەفتادا، لەدوو رێگاوە من کاك محێدین زەنگنەم ناسی، یەکەمیان هاوڕێ خۆشەویستەکانم و بەتایبەتی حسێن عارف و شێرکۆ بێکەس و کاکەمەم بۆتانی بوون، دووەمیان بەهۆی بەرهەمە دیارو ناوازە شانۆییەکانی‌و بەتایبەت پرسیارو مۆڵەت کەیەکەمیان خەڵاتی چاکترین دەقی عێراقی ساڵی 1975 1976ی درا بوویە کە ئەوسا لووتکەی بەخشینی ئەوپیاوە بەتوانایە بوون.*

*ئەو هاوڕێ خۆشەویستانەم لەزۆربەی دانیشتنی تایبەتی خۆماندا ناوی محێدینیان دەهێنا، چ وەك کاریگەری لەسەر بزووتنەوەی شانۆو چ وەك مرۆڤێکی بەهەڵوێست و ئاگادار بەسەردەمەکەی.*

*لەناوە ناوە هاتوچۆی ئەوسای بەغدادمدا محێدینم ناسی، بەماوەیەکی کەمی یەکتر ناسین هاورێیەتیەکی تەمەن درێژمان خولقاند، ئیتر هەموو جارێك یان لەبەغدای ئەبونەواسدا یان لە بەعقوبەی باخی پرتەقاڵدا تا ئێستایش هەر لەوێ مامۆستایە، دەبوو یەکتر ببینین. لەکۆتایی ساڵانی هەشتایشدا کەپەیمانگای هونەرە جوانەکانی سلێمانی فێستیڤاڵی ساڵانەی شانۆییان سازدەدا محێدین زەنگنە لەناوە هەرە دیارەکانی ئەو ئامادەبووانەوە بوو کە شوێن دەستی داهێنانیان بەشانۆی عێراقیەوە دەردەوشایەوە. کە دەگەیشتە سلێمانی پێی دەوتم: ئێستا هەست دەکەم لەشارێکدام خۆشی دەویم و منیش تا سەر ئیسقان دەیپەرستم. ئیدی ئەو رۆژانەی فێستیڤاڵ لەپەناوە باسی ئەو کۆترانەمان دەکرد کەتەقەی ناوەخت هەڵی فراندوون و ئێستاش لە هۆڵی شانۆو ژوانەکانماندا گمەی ئاوارەییان دەبیستین.*

*باسی ئەو شانۆگەریانەی نمایش دەکران و ناوەکان نەیان دەتوانی راویان بکەن، لەو سکاڵاو دەردە دڵانەیش دەدواین کە تا ئێستایش بێجگە لەئامازەی نێوان دوو ئەستێرەی دوور ئەو ناتوانێت بیانکات و، رووبەڕوویش گاڵتەمان بەو قەڵەمانە دەکرد کە کاتی خۆ کوشتنیان هاتوودو باساوە گەپجارەکانیان ناتوانن سەری خەجالەتیان پێ بەرز بکەنەوە.*

*گەورەیی محێدین زەنگنە لەوەدایە کە خۆی بەبچووك دەزانێت، خاکیە چونکە بەهرەی زۆرە، ئەدیبە چونکە عەشقی کارەکەی خەریکە چاوی پێ لەدەست دەدات و کەچی خۆی بەدەستەوە نادات. ئێمە دەمانزانی یەکێکە لەپێشەنگەکانی شانۆی عێراق و لەسەر ئاستی وڵاتە عەرەبەکانیش ناوێکی درەوشاوەیە، کەچی ئەو گوێی بەوە نەدەداو خەمی سەختی ئەوە بوو کە بۆ ناتوانێت بەزمانی میللەتەکەی خۆی بنوسێت! هەر ئەم هەستە ئینسانیەی بەردە جۆرە نووسینێکی برد کە بە زمان عەرەبی‌و بەناوەڕۆك کوردی بن، لەوانە شانۆگەری کاوەی دلدار-ورۆمانی ئاسۆس بوون. لەو بەرهەمانەدا بەردە کەسانێکت دەکاتەوە کە هەموو بەها کۆمەڵایەتی و ئاکاریەکەیان لەوەدا دەبینینەوە کەسەر بەگەلێکی چەوساوەو بەراوێز کراون، بەڵام ئەو واقیعە نەی خستوون و روو لەئاسۆن، هەر ئەو خۆشەویستی‌و بێ زانینە بووە هۆی ئەوەی گەلێك لەشانۆگەریەکانی بکرینە کوردی‌و نمایش بکرین وەك: نهێنی، پرسیار، تۆڵە، گوڵەکان بۆ کین و چیرۆکی دوو هاوڕێ کە لەساڵی 1986 دوە خۆم وەرم گێراوەو بواری بڵاوکردنەوەیم نەبووە. سڵاوم بۆ ئەو هاورییەی کە بڕوای بەوەیە دیوارە ئاسنینەکانیش هێلانەی خۆشەویستیان لەسەر دەگرێت.*

**رەووف بیگەرد**
2000/4/17



## هونەرمەندی شیوەکار
## "بەختیار مستەفا"

*لەسلیمانی لەدایك بووە
*لەسالی 1980 ئەکادیمیەی هونەرە جوانەکانی بەغدا-بەشی نیگارکیشانی تەواو کردووە.
*هاوبەشی لەدامەزراندنی { پەیمانگەی هونەرە جوانەکانی سلیمانی 1980- بەشی هونەر لە پەیمانگەی مامۆستایانی 1992- پەیمانگەی مەلبەندی 1996- کۆلیجی هونەر لەزانکۆی سلیمانی 1998 } کردووە.
*لەسالی 1986 سەرۆکی بەشی شیوەکاری بووە لەپەیمانگەی هونەرە جوانەکانی سلیمانی
*ئیستا مامۆستایە لەکۆلیجی هونەر-زانکۆی سلیمانی.
*هاوبەشی لەدامەزراندنی یەکەم گروپی"شیوەکاری لەکوردستان دا کردووە بەناوی " کۆمەڵەی هەشت".
*لەزۆربەی چالاکیە شیوەکارو پیشانگە هاوبەشیەکانی هونەرمەندانی کوردستان دا بەشدار بووە.
*هاوبەشی لەپیشانگەی هونەرمەندانی کورد دا کردووە لە لەندەن، ئیتالیا، ئەلمانیا، کەنەدا، هۆلەندا.
*تا ئیستا نۆ پیشانگەی تایبەتی بۆ بەرهەمەکانی کردۆتەوە.
*گەلیك نوسینی رەخنەی‌و شیوەکاری‌و لیکۆلینەوەی لە رۆژنامەو کۆڤارەکاندا بلاوکردۆتەوە.

(رۆڤار) مانگانەیەکی رۆشنبیری‌یەو هەر ژمارەی تایبەتە بۆ داهینەریك
ناونیشان:سلیمانی فولکەی یەکگرتن دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم-رۆڤار-ت:29839
لەدەرەوەی کوردستان:
Tel:0044 162 846008 Fax:0044 162 84 77660

چاپخانە : ئوفسیتی دلیر

# بیبلۆگرافیای ژیان و بەرهەمەکانی

*محێدین حەمید زەنگنە، سانی 1940 لە گەڕەکی شاترلوو لە شاری کەرکوک لە دایك بووە.

*1958 ئامادەیی لە کەرکوك تەواوکردووە و 1962 کۆلیژی ئەدەبیاتی- بەشی عەرەبی لە بەغدا تەواو کردووە و بۆتە مامۆستای زمانی عەرەبی لە خانەقین و باقووقە و ئیستا خانەنشینە و لە باقووبە دادەنیشێ.

*لە سالی (1957)ەوە بەرهەمەکانی بلاوکردۆتەوە، زۆربەی بەرهەمەکانی لە پایتەختی ولاتانی عەرەبی نمایش کراون.

**بەرهەمەکانی:**

-"نهینی" -شانۆگەری- 1968، لە چەند شاری عیراقدا نیشاندراوە، وەرگیردراوەتە سەر زمانی کوردی و تیپی نەقابەی کریکارانی بنیاتنان لە سلیمانی پیشکەشیان کردووەو جەلیل زەنگنە دەریهیناوە.

-الجراد- کوللە- شانۆگەری 1970، ئەو سالە خەلاتی کتیبی لە -مربد- وەرگرت.

-السؤال -پرسیار- شانۆگەری 1976، وەرگیررایە سەر زمانی کوردی و لە هەولیر پیشکەش کرا. سالی 1975 خەلاتی باشترین دەقی شانۆیی لە عیراقدا وەرگرت. تیپی شانۆی (الطلیعة) لە کویت 1980 پیشکەشی کردووە.



-الاجازة -مۆلەت- سالی 1977، شیرکۆ بیکەس وەریگیراوەتە سەر زمانی کوردی‌و تیپی شانۆی پیشرەو لە سلیمانی پیشکەشی کردووە، ئەحمەد سالار دەریهیناوە.

-فی الخمس من القرن العشرین یحدث هذا- لە پینجیەکی پینجەمی سەدەی بیستەمدا ئەمە روو دەدا- 1979، وەرگیردراوەتە سەر زمانی کوردی‌و لە هەولیر پیشکەشکراوە، خەلاتی "دەقی عیراقی" لە 1979 وەرگرتووە.

-الیمامة- کۆتری کیوی- 1980

-مساء السلامة ایها الزنوج البیض- ئیوارەتان باش ئەی پیست رەشە سپی‌یەکان- 1981، سالی 1986 لە مەغریب پیشکەشکرا.

-العلبة الحجریة -قووتووی بەردین- 1982، خەلاتی باشترین دەقی وەرزی 1982-1983 لە عیراقدا وەرگرت، کتیبی میللی توانذن" سالی 1988 لە بەغدا پیشکەشی کردووە.

-لمن الزهور- گولەکان بۆ کێ- 1983، ئازاد بەرزنجی کردوویەتی بە کوردی و تیپی پیشرەو لە سلیمانی نمایشی کرد.

-صراخ الصمت الاخرس- هاواری بیدەنگیەکی کەر- 1984، هونەرمەند عەونی کەرومی سالی 1985 دەریهیناوەو سالی 1992 لە عەمانی پایتەختی ئوردون نمایش کرا.

-حکایه صدیقین- حیکایەتی دوو هاورێ- 1986 هونەرمەند سامی عبدالحمید سالی 1988 دەرهیناوە و رەئووف بیگەرد کردوویەتی بە کوردی و بلاو نەبۆتەوە.

-الحارس- ئیشکگر- 1987، هونەرمەند مەکی حداد سالی 1988 دەریهیناوە.

-تکلم یاحجر- ئەی بەرد قسە بکە- 1989 لە شانۆی رەشید لە بەغدا پیشکەشکرا.

-هل تخضر الجذوع- قەدەکان سەوز دەبنەوە- 1988

-کاوە دلدار- 1989

-رؤیا الملك- خەونی پاشا-1998.

**رۆمانەکانی:**

-هم.. او یبقی الحب علاقة.. ئەوان یا خۆشەویستی وەك نیشانەیەك دەمینیتەوە 1975 لە دیمەشق چاپکراوە.

-ئاسۆس.. 1977.. لە بەغدا چاپکراوە.

-بحثا عن مدینة اخری.. گەران بەدوای شاریکی دیکەدا.. لە دیمەشق چاپکراوە.

**چیرۆکەکانی:**

-الموت سداسیا.. "مردنی شەش قۆلی" چیرۆکی دریژ 1970.

کتابات تطمح ان تکون قصصا.. ئەو نووسینانەی دەخوازن ببنە چیرۆك- دەزگای عەرەبی بۆ چاپ و بلاوکردنەوە 1984، غەفور سالح عەبدوللا کردوویەتی بە کوردی.

**بەشیك لەو نووسەرانەی دەربارەی بەرهەمەکانی محیدین نووسیوویانە:**

1-لەمەر چیرۆکی کوللە- جاسم عاصی- رۆژنامەی التاخی-1968.

2-ئیوارە کۆریکی محیدین زەنگنە- سەرنووسەر- الفکر الجدید-1977.

3-گەشتیك بە دنیای هونەری محیدین زەنگنەدا- جلال وردە- الثقافة-1981.

4-چیرۆکەکانی محیدین زەنگنە- حسب الله یحیی- کاروان- 1984.

5-ئەو نوسینانەی دەخوازن ببنە چیرۆك- نجاح هادی کبە العراق- 1984.



6-ئەو نوسینانەی دەخوازن ببنە چیرۆک-د. علی جواد الطاهر- الجمهورية- 1985.

7-ئەو نوسینانەی دەخوازن ببنە چیرۆک- یاسین النصیر- کاروان- 1986.

8-کۆمەڵە چیرۆکێکی نوێ- عبدالمجید لطفی- العراق- 1986.

9-قایلی چیرۆک- مومتاز حەیدری- العراق- 1987.

10-کێی شیعر لە گۆشەگیری محێدین زەنگنەدا- محمد اسماعیل- العراق- 1992.

11-لە (گۆشەگیری)دا لەگەڵ محێدین زەنگنە- صلاح الانصاری- العراق- 1992.

12-رۆمانێك لە سەر شەوی مرۆیی. فاضل العزاوی- طریق الشعب-1976.

13-دوو را لەسەر (ئاسۆس).. قاسم حمزة-منیر یاسین- طریق الشعب- 1977.

14-رۆمانی ئاسۆس- انور محمد طاهر العراق- 1977.

15- ئاسۆس.. خۆشەویستە بۆ خەڵك و ترسیشە لێیان- ناجح المعموری - الفكر الجدید-1977.

16-لەگەڵ رۆمانی خۆشەویستی بە نیشانە دەمێنێتەوە) نووسەری عیراقی قاسم محمد توفیق- الرای الاردنیة-1977.

17-ئاسۆس، ئادەمیزادو رووداوە گەورەکان لە چەند ساتێکدا- محمد حسین سلیمان- العراق- 1977

18-پێشەکیەك بۆ توێژینەوە لە رۆمانی عیراقی- نجم عبدالله کاظم- الاقلام-1986.

19-محێدین زەنگنە وەك رۆمان نووسێك- تێبینی بە سەرەتاییەکان- باسم عبدالحمید حمودی القادسیه- 1993.

20-بۆ (خۆشەویستی بە نیشانە دەمێنێتەوە- عبدالله ابراهیم الشیخ- الموقف الادبی-1996.

21-نهێنی بانگەوازو بانگهێشت، صالح مهدی- النور ژ:3-1968.

22-شانۆنامەی نهێنی و دان بە خۆداگرتنی پێشمەرگانە-یحیی ادریس- الجمهوریة- ژك311-1968.

23-نهێنی جلال وردە-النور ژ:56-1968.

24-نهێنیو دۆزەکانی ئادەمزادی هاوچەرخ-هادی الربیعی- الجیل الجدید- 1968.

25-نهێنی- آمال الزهاوی- پاشکۆی (الف باء) 24-1968.

26-نهێنی- عبدالسلام حلمی- التاخی-1968.

27-رەگەزی زەمەن لە شانۆگەری نهێنیدا- احمد خالص الشعلان- الفنون المعاصرة-1968.

28-ئەزمونی خەبات لە شانۆگەری نهێنیدا- سلیمان البکری- الف باء-29-1969.

29-شانۆ گەریەکانی کوشتار یا ململانێ لە سەر زەوی- سامی خشبة الآداب- 3-1969.

30-نهێنی زەنگنە- حسب الله یحیی- پاشکۆی (الجمهوریة) 437-1969.

31-شانۆگەری نهێنیو گەران بە دوای شانۆی بەرگریدا- سامی خشبە- اخبار المعلمین-18-1969.

32-شۆرش لە شانۆی عەرەبیدا- فؤاد وزارة- الآداب-5-1970.

33چەند تێبینییەك لەسەر بەخشینە ئەدەبیەکانی شەستەکان- سلیمان البکری- الجمهوریة- 407-1970.

34-کوللەو رشانەوە بەیەك دەگەن- حسین الحلبی- التاخی-1971.

35-چەند سەرنجێك لەسەر شانۆگەری کوللە- ناجح المعموری- المسرح والسینما-1971.

36-رەمز لە شانۆگەری کوللەدا- هادی الربیعی- الثقافة-1971.



37–له شانۆگەری کوللەدا چی– سلیمان البکری– الثقافة–1971.

38–ئینســـان و دامـــاڵین و کوللـــە– یوســـف عبدالمسیح ثروة– الثقافة الجدیده–1971.

39–ئایا کولله هەولێکه بۆ رزگاربوون– عبدالستار ناصر– الف باء– 1971.

40–(پرسیار) لـه لایـەن تیپـی شـانۆی ئـەمڕۆ– سەرنوسەر– الهدف–1975.

41–(پرسـیار) نمایشـی داخـراو– سەرنوسـەر– الهدف–1975.

42–دەربـارەی پرسـیار– سەرنوسـەر– الهـدف– 1975.

43–شـانۆنامەی پرسیار– قاسم حـول– البـلاغ– 1975.

44–دەربارەی شانۆنامەی پرسیار– علـی مزاحم عباس– الاقلام– 1975.

45–پرسیار لـە کویدایـە– علـی مزاحم عبـاس– الثورة– 1975.

46–پرسیار لە نیو چیرۆکی (صەفوان)دا–جمیـل روفائیل– الثورة–1975.

37–پرسیارو وەڵامی خوازراو– حسین الکاشف– الثورة–1975

48–پرســـیارو پرســـیارەکانی دی– بینـــەریك– المثقف الجدید–1975.

49–دەربارەی پرسـیار– حسـین محمـد سـعید– البیان المغربیة– 1975.

50–تیپـی شـانۆی ئـەمرۆ– پرسـیار– خلیـل الاسدی– طریق الشعب–1975.

51–کاراکتـەریکی لاو لـە شـانۆنامەی پرسیاردا– المحـرر– طریـق الشـعب– 1975.

52–ئاسودەیی پرسیار– د. علی جواد الطاهر– 1975.

53–پرســـیارو پـــەیامیکی رۆشـــنی کەلـەپورە– یاسـین النصـیر– طریـق الشعب– 1975.

54–پرسیار لـە نیوان کـاری درامـیو شیوەی دەربرین– ضیاء خضیر– الف باء–1975.

55–پرســـیار لـــە چیرۆکی دکتـــۆر صەفوان– الجمهوریة– 1975.

56–پرســـیار لـــە ســـەر رابـــوردو و ئاینده– حسب الله یحیی– الجمهوریة– 1975.

57–"پرســـیارو شـــانۆی هـــزری سەرکەوتوو" –جهاد زایـر– التـآخی– 1975.

58–پرســـیار.. صـــەفوان خـــۆی دەکـوژێ– موفـق شـدیدی– الفکـر الجدید–1975.

59–شـــانۆی پرســـیار– عبدالامـــیر السماوی– المرفا–1977.

60–خویندنەوەیـەك لـە سـەر شـانۆی پرسـیار– عبـدالله نبـازی– الاقـلام– 1977

61–پرسیاری کـاری دووفـاق– نـاجح المعموری– طریق الشعب–1977.

62–پرسیار– حسن عبدالهادی– عالم الفن الکویتی–1980.

63–شـــانۆی پرســـیار– حســـن عبدالهـادی– عـالم الفـن الکویتـــی– 1980.

**وتارەکانی:**

1–عبدالمجیـد لطفـی.. ذلـك الانسـان– الفنـون المعاصرة–5–1968.

2–نحو فکر جدید–الفنون المعاصرة–5–1968.

3–الادب الکردي و ستار الصمت– التآخي–6–8–1968.

4–مسرحیة مشمة وابطال عـائمون الهـواء– الـف باء–87–1970.

5–تأملات في المسرح العراقي المثقف الجدید– 1–1971.

6–ماذا وراء التضلیـل الادبـي– الـف بـاء–131– 1972








7-تذكر قيصر ولا تنس المسرح في بعقوبة- الف باء-180-1972.

8-ادبنا وآفاق التطور الجديد- التاخي-1090-1972

9-اصوات جديدة في الشعر الكردي المعاصر- الثقافة الجديدة-38-1972.

10-بحثا عن كوميديا عراقية- المسرح و السينما-2-1972.

11-العراب رواية مع المافيا لاضدها- الفكر الجديد-47-1973.

12-هل توجد موسيقى كردية- التاخي-1437-1973

13-بلغارية الاشتراكية و سرير بروكروستيس- طريق الشعب-11-1973.

14-حول الموسيقى الكردية- التاخي-7341-1973

15-ثلاث نقاط ضد النقد الادبي في العراق- طريق الشعب-55-1974.



16-المسرح الكردي من الواقع القومي نحو الافق الانساني- طريق الشعب-162- 1974.

17-ثقافة كردية.. لماذا-طريق الشعب- 334-1974.

18-الفعل ام الكلمة.. المثقف الجديد- 13-1974.

19-علامات في الواقع النقدي- المثقف الجديد-15-1974.

20-علامات في الواقع النقدي- المثقف الجديد-16-1974.

21-نحو ارضية ماركسية للنقد- الثقافة الجديدة-59-1974.

22-الوجه والقناع- الثقافة الجديدة-58-1974.

23-محمد خذ حقيبتك-الثقافة الجديدة-62-1974.

24-انطباعات سريعة- طريق الشعب-45-1975.

25-انطباعات في المسرح البلغاري-طريق الشعب- 125-1975.

26-الطليعة في مفتتح عام جديد- طريق الشعب-409-1975.

27-البيت الجديد بين الطموح.. والواقع المتحقق-طريق الشعب-617-1975.

28-ماركيوز فلسفة الطريق المسدود- طريق الشعب-649-1975.

29-المفتاح في بعقوبه-المثقف الجديد-41-1975.

30-حجر صغير.. في بركة كبيرة- المثقف الجديد-41-1975.

31-عن الشاهد-المثقف الجديد-43-44-1975.

32-ملاحظات وانتقادات في واقع الحركة الكردية-الرائد-22-11-1975.

33-ملاحظات وانتقادات في واقع الحركة الكردية-الرائد-29-11-1975.

34-الشيخ محمود الحفيد- الرائد-29-11-1975.

35-القصة المزدوجة للدكتور بالمي- طريق الشعب-804-1976.

36-الوريث ادانة الملكية المتغلة وقانون الوارثة طريق الشعب-825-1976.

37-الالتصاق بالواقع عبر الانفصال عنه-طريق الشعب-947-1976.

38-حول ازمة الكتاب العراقي-طريق الشعب-850-1976.

39-معركة القديم والحديث في الادب الكردي المعاصر-الرائد-2-3-1976.

40-اهر نبورغ و الابداع الروائي- الفكر الجديد-173-1976.

41-قراءة نقدية- المثقف الجديد-46-1976.

42ملتقى القصة الاول وطموح القصاصين الاكراد-طريق الشعب-1481-1978.

43ملاحظات حول المنهج وملاحظات اخرى-شمس كردستان-52-1978.

44-راي حول ملتقى القصة الاول-الطليعة الادبية-10-1978.

45لاكتوبر61 عاما- الفكر الجديد-315-1978.

46-عن القصة الكردية- الاقلام-2-1978.

47-في كتاب واحد- الفكر الجديد-338-1979.

48-نحو تكامل فني في العرض المسرحي-فنون-172-1982.

49-عام على غياب كاتب-العراق-22-9-1984.

50-المحددات التخطيطية لانبية المسارح وتقيمها- الاقلام-3-4-1987.

51-الرواية-الاقلام-5-6-1993.

52-مسرحية فيصل على طريق الموت-الجمهورية-8678-1994.

53-صرخات من "صراخ الصمت الاخرس)-الجمهورية- 22-7-1995.

54-عن الماكير الفنان ياسين علوان- الجهورية-9011-12-8-1995.

55-قوة الكلب العجوز- الجمهورية-9263-1996.

56-المسرح الاحتفالي و حدود الكائن والممكن فيه- الجمهورية-

# دەشت و چیا

عوسمان شەیدا




مێژوو یان فەلسەفە لەو بابەتانەن کەدەبێ بەچڕی لەنێو کتێبـاندا خوێندنـەوەو لێتوێژینەوەی‌لەسـەر بکرێ، بـەلام شـانۆنامە بەتەنـها هەرتەختـەی شـانۆ جێگای مشت و مڕی جەماوەرەکەیەتی.. کاتێکی ئێمە قسە لەسەر دەقێکی شانۆیی دەخوێنینەوە ڕاستەوخۆ خـەیاڵمان دەچێتـە سـەر شـێوازی دینامیکیانـەی کاراکتـەرەکان لەچۆنیـەتی ئـەنجامدانی پرۆسـەی گەیاندنی دەقەکە.. خۆئەگەر نەتوانرا بینـەر بکرێتە بەشێك لەو نمایش و دەقەو نەبزوێنرێن، واتە شانۆ نامەکە ئەرکی بابەتی و هونـەری خۆی نەگەیاندووە، ڕۆشنتر بڵێم یادەقەکە هیچ بووە یان کاراکتەرەکان لە ئاوێتەکردنی بینەران بەدەقەکەدا لەوناستەدا نەبوون.

هەروەکو ڕێ بەوەش دەچێ زۆری نمایشی سەقەت چێژی‌خەڵکیی نەهێشتبێ و حاڵەتەکەی بەئیفلیج بوون بردبێ.

ئەو چەند دێڕەم بۆ ئەوەیە بڵێم (هێندەی زانیاریم هەبێ) لەمەڕ دەقە شانۆییەکانی (محێدیـن زەنگنـە)ی قەڵـەم ڕەنگینـم وەلەبـەر ڕۆشـنایی بیبلۆگرافیـا ئامادەکراوەکەی _صباح الانباری-دا کەتیایدا ئاماژە بەبیست و چوار شانۆ نامەی ئەو مامۆستایەکراوەکە بـەپێی بیبلۆگرافیاکـە نـۆ دەقیـان کراونەتـە کوردی‌وهەروەها بیست و نۆ جار ئەو دەقانە لەنێو عێراق و دەرەوەیدا نمایش کراون، یانزە خەڵاتیشیان دراوەتێ؛ ئەمە وێڕای سەدو سیوهەشت نووسین کەبە تەنێ دەربـارەی شـانۆ نامـەکان نووسـراون ئەڵبـەت لەلایەن ئەو قەڵەمانەوە کەلەڕەوتی شانۆ بێ ئاگانیم؛ لـێرەدا پێویسـتە ئامـاژەش بـەوەبکرێ کەدەشـێ و هەروەك ئاساییە شێوازی لێکدانەوەو خوێندنەوەو بۆ چوونەکان بکرێتە چەند تەوەرێك و بەسەر زۆر هێمادا دابەش بکرێن وەڵێ لەئاکامدا هەموو ئەو لێکدانەوانەو خوێندنەوانـە لـەکرۆکێکدا کۆکـن ئـەویش: محێدیـن زەنگنە؛ چارەنووس، هەواڵی زاڵبوون بەسەر هێزەکانی دژی خود، ڕەسەنێتی لەهەڵبژاردناو خستنە ڕوی ئەو پرسیارانەی پێشتر ئازایـەتی لـەدەربڕینیاندا ((ئەگـەر بوبـێ)) ئەوانـەو زۆر فاکتـەری دی هـەوێنی کارەشـانۆییەکانی ئـەون هـەروەکو دەق لای (محێدیـن زەنگنـە) وەك چـۆن هونـەرە دەبـێ لەتێگەیشـتنی



بابەتیانەی کێشەکانیشدا پراکتیزەی خۆی بکا، هەروەکوخاسیەتیەکی تری کارەکانی زەنگنە وەڵامدانەوەی پرسیارە زۆرەکانی تایبەتمەندێتی دەقی شانۆییە.بەهەرحاڵ ئەمە وەك تیرۆژێکی بچوك بۆسەر کارە شانۆییەکانی دەنا کورتەچیرۆك و ڕۆمانەکانی زۆر نووسین هەڵدەگرێ، ئەگەرچی تائێستا ئەوی پێویستەبۆی نەکراوە هەربۆیە ئەم هەوڵەی (ڕۆڤان) لەنەخشەی پرۆژەکەیدا بۆ (محێدین زەنگنە) لەداهاتودا جێی دیاری خۆی دەبێ.

*ناونیشانی پرۆژەی ئەو کتێبەیە کە نووسەر (صباح الانباری)وەك بیبلۆگرافیایەك بۆ کارەکانی محێدین زەنگنە بەدەستیەوەیە چاپی بکا.

# "سزا"

جەمال غەمبار لەعەرەبییەوە کردوویەتی بەکوردی

**کاراکتەرەکان:-**

*حامید: بازرگانە.
*ساجید:کوڕی حامیدی بازرگان.
*بەسمە: ژنێتی.
*شەریف:باوکێتی.
*سەلما:دایکێتی.
*حەسەن:مامێتی.
*سەعدیە:ژنی مامێتی.
*شاکر.
*حاجی سەلیم.
*سەعدون.
*چەند ژنێك.
*چەند پیاوێك.
*هەندێ لەکوڕو کاڵان.

## "فەسڵی یەکەم"

**دیمەنی یەکەم::**

{کات پێش خۆرئاوا بوونە، شاکر بەتەنها خۆیەتی، بۆ ئەم لاولا ئەڕوانێت و بەدەستەکانی خەریکی ئیشارەت کردنە}

شاکر:لێرەوە خەڵکینە لێرەوە.. " هەنگاوەکان لە نزیك بونەوەدان. دەنگ دێ دەنگەکان: خودا بێ شەریکە.. ئەڵڵاهو ئەکبەر. خودا تاك و تەنیایە.. هتد".

{شاکر بەپەلە بەرەو لایان ئەچێت، لەداگرتنی تەرمەکەدا یارمەتییان ئەدات". ئەوەتا گۆڕستانەکە وەك بەری دەستی من ساف و روونە.. رێگاکانیشی وەك شەقامەکانی شار گیراونەتەبەر

حاجی: شاکر گوناهە پێ بەسەر گۆڕەکاندا بنێین (پاشان روو لەپیاوان ئەکات) بەنەرم و نیانیی. برایان نەرم و نیان بن.. مردوو وەك زیندوو وایە. رقی لە زەبرو زەنگەو حەزی لەسۆزە.. خوایە هەر تۆ هەیت.. هەر تۆ

پیاوێك: ئەم مردووە هێندەی بەدەست مەینەتیەکانی ژیانی فانییەوە چەشت، ئیتر بەسیەتی



یەکێکی‌تر: خوا هیدایەتی ئەو و ئێمەش و هەموومان بدات.. هەر بەتەنێ خۆی عاریفی نهێنیەکانە..

شاکر: خوا رەحمی پێ ئەکات پێغەمبەری بەخشندە فەرموویەتی: هەمیشە چاکەی مردووەکانتان لەیاد بێت.

پیاوێك: (بەزۆر لەخۆکردنەوە) ئەی ئەگەر چاکەی نەبووبێت.

سەعدون: هەموو مرۆڤێك چاکەی هەیە، هەروەك خراپەشی هەیە.

پیاو: (بەخەمێکەوە) تەنها حامید نەبێت، ئەو حامیدەی کەبەهۆی کاری بازرگانیی خۆیەوە، ئەو بازرگانییەی لەرادەیەکدا نەوەستا، هەموو فرۆشیارەکانی کوشت.

حاجی: سالح: رۆحی خۆت لەئاگری قین پاك بکەرەوە، هەر چییەك بوو، بوو تازە پیارەکە مردووەو تۆش داوای رەحمەت و بەزەیی بۆ بکە و بڵێ‌خوا عافووی کات

" دەنگی تیژی شیوەن دێت"

حەسەن: ئەوەتا .. ئەوە ..ساجیدە.. بەڵێ ساجید خۆیەتی.. جارێکی تریش هاتەوە لامان

شەریف: ئاه..ئەم کورە چی بەمن ئەکات خوایە..( هەردوو دەستی بەرەو ئاسمان بەرز ئەکاتەوە) خودایە یەکێکت لێ سەندمەوە، ئیتر بۆچی

حاجی: بێ دەنگ بە شەریف.. بێ دەنگ بە و کفر مەکە.. تۆ پیاوێکی ئیمانداریت.. چیت لێ‌قەوماوە؟

شەریف:ئەی نابینیت چیمان بەسەر هاتووە ئەی گەورەی ئێمە؟ من پشتم شکاوە.

حاجی:کوڕم .. منالەکانمان وەك ئەمانەتێك وان خوای گەورە لەلای ئێمەیان دائەنێت هەرکاتێکیش

بیـەوێت ئەیانباتـەوە. نابـێ سـکاڵاو نـاڕەزایی لەمەشینەتی ئەو مەزنە دەربڕین

چـەند دەنگێـک: ئامـەنتو بیلـلا.. باوەڕمـان بەخوایە

حاجی: ( پاڵـێ بەشـەریفەوە ئـەنێت) دەی سـا شـەریف بـڕۆ بـەلای کوڕەزاکەتـەوەو مەهێڵـە خـۆی باوێتە قەبرەکەوە.

شەریف: (بەلاوازییـەکی زۆرەوە) ئـاخ خودایـا.. بۆچی منت لەجیاتی حامید نەبردوە.

حاجی: ئەعوزو بیلاهی مینەلشەیتانلرەجیم.. تۆ فـەرمان ئەدەیتـە خـوا.. ئـەعوزوبیللا.. خـوا خـۆی ئەزانێ کێ ئەباتـەوە بـۆ لای خـۆیو وازیـش لـەکێ ئەهێنێ.. ئادەی شەریف تۆ بە لای خوای خـۆت بکە.. دەی تۆبە بکە..

حەسـەن: (لەدەرەوەیـە) سـاجید.. کـوڕم سـاجید بەسە.. ئیتر بەسیەتی.. (لەگەڵ کوڕەکەیدا کە لەخوار تەمەنی دەساڵانەوەیە ئەگەڕێتەوە لای ئەمان)وەرە.. وەرە.. عاقڵ بە.. کوڕم عاقڵ بە

ساجید: ( بـەرەو دارەمەیتەکـە خـۆی ڕەپێـش ئەکات) لێم گـەڕێن باسـەیری کـەم.. ئەمـەوێ بـاوکم ببینم( (هەندێکیان ناهێڵن بیبینێ)

پیاوێك: ئـەرێ تـێرت ئـەخوارد لەسـەیرکردنی.. بەم ڕۆژگارە تۆ بەسەر سەریەوە بوویت..

ساجید: مامە گیان لێم گەڕێ.. لێم گەڕێ با بۆ دواجار مـاچی بکـەم.. ( بـەدەوری دارەمەیتەکـەدا ئەسوڕێتەوە)

سەعدون: لا حول ولا قوة الا بالله.. ئـەم کـوڕە سەری باپیرەی خۆی ئەخوات..

شەریف: (ئیشارەتی دارەمەیتەکە ئەکات) ئـەوە باپـیرێتی.. بـاوکێتی.. هـەروەها باپـیرەو بـاوکی منیشە.. ئای.. حامید چ زامێکت کردە دڵمەوە.. چ زامێك..( بەبێ دەنگی ئەلاوێنێتەوە).

حاجی: گوناهە.. وەڵلاهی گوناهە.. ئەوەی ئەم کوڕە ئەیکات حەرامە.. شەریف مەهێڵە وابکات، خۆ تۆ لای خۆت.. ئەزانیت ئیمان لەکفر جیا بکەیتەوە( شـاڵاو بـۆ سـاجید ئـەبات).. کـوڕە لـەو دارەمەیتـە دوورکەوەرەوە.. دەی.. واز لەم ڕەفتارانە بهێنە

شەریف: تـو خـوا حـاجی گیـان وازی لێ بێنە.. خوام کرد بەگژتا ئەگەر وازی لێنەهێنیت

حـاجی: وازی لێ بهێنم دارەمەیتەکـە بکاتـەوەو کفنەکـە بدڕێـت؟ نـا بـەخوا شتی وا نـابێت.. ئەمـە بیدعەیەکە، نـەخواو نـە پێغەمبەرەکـەی پـێی ڕازی نین.. بەڵکو.. بەڵکو، چ خواو چ پێغەمبەریش لەم بیدعەیە تووڕە ئەبن.. کوڕە لاچۆ.. دەی لاچۆ

پیاوێك: (قسەی پێ ئەبڕێت) ئەوە مێرد منداڵە.. مێردمناڵ.. نازانێ چی ئەکات

حاجی: ڕاستە ئەو مێرد مناڵە.. بەڵام خۆ ئێمە مناڵە وردکە نین تاکو بهێڵین شتێ بەبەرچاومانەوە ڕووبدات کە خوا تووڕە بکات و ڕۆحی مردووەکانیش نیگەران.. شاکر خێراکە.. دەستو بردێ بکە با خوالێخۆشبوو بەخاك بسپێرین

شـاکر: ( لـەناو قەبرەکـەوە) قەبرەکـە ئـەوەندەی نەماوە.. تەنها لەلای سەریەوە تۆزێك فراوان کردنی ئەوێ

حـاجی: کـاتی نوێـژی ئێوارەیـە.. ئـەبێ بگەڕێینەوە مزگەوت

شاکر: (بەقەڵەمبازێ لەقەبرەکە دێتە دەرێ) ئـەی گـەورەمان تـەواو بووم.. تـەواو بووم.. پشـت بـەخوا بادەست بەکاربین

چـەند دەنگـێ: ئـەڵلاهو ئەکبـەر.. ئـەڵلاهو ئەکبەر.. ئادەی دەستێکی بدەنێ ڕەحمەتی خواتان لێ بێ.. ئەلفاتیحا.. برایان فاتیحا دابدەن.. {ڕێ و ڕەسمی بەخاك سپاردن دەست پێ ئەکات.. شـەریف کوڕەزاکـەی لـەباوەش گرتـووەو پێکـەوە شـیوەن ئەکـەن... پیـاوان لەشـەریف و لەبراکـەی نزیـك ئەبنەوەو پرسـەو سەرەخۆشـی لێ ئەکـەن.. ناتوانـێ هیچ بڵێت.. }

حەسـەن: ( وەڵامـێ ماتـەمگێڕان ئەداتـەوە)خـوا جەزاتان بداتەوە.. خوا جەزای بەخێرتان بداتەوە لە مردووەکانتان خۆش بێت

حاجـی: ئـەرکی سەرشـانم بـوو لەگـەڵتان بمێنمەوە، بەڵام کاتمان درەنگە

حەسـەن: خـوا جـەزای بـەخێرت بداتـەوە ئـەی شێخی بەرێزمان.. خوا یار بێت چاکەی ئێوەمان بیر ناچێتەوە

حـاجی: (بەشـەریف ئـەڵێت) پشـت بـەخوا، هەموومان ئەم ڕێگەیەمان لەبەرە

شەریف: ئامەنتو بیللا.. ئامەنتو بیللا..

حاجی: بیرت نەچێ سوورەتی " یاسین"بۆ ڕۆحە چاکەکەی بخوێنیت.. بەرەحمەتی خوا بچێ

شەریف: ئەوە ئەزر بێ لەسەرم کە حەوت جار، نەك جارێك و دوان، بەڵکو حەوت جار ئەو سوورەتە بخوێنم

سەعدون: بڵێ ئینشاللا.. ئینشـاللا.. جەماعـەت من بەدوعا.. خوا حافیز..

{هەمووان ئەڕۆن.. بەتەنها شاکر ئەمێنێتەوە کە بەیارمـەتی حەسـەن قەبرەکـە ئەکوتنـەوە.. شـەریف ئەگری}

شاکر: ئەرێ لەهەمووی چاکتر ئەوە نییە دەست بکەین بەخوێندنی سورەتی "یاسین" و ئەجرێکمان لەخواوە دەست بکەوێو.. پاشانیش لەعەزابەکانی ڕۆحـی کوڕەکـەت کـەم بکەینـەوە

حەسـەن: (بەتووڕەییـەوە) ڕۆحـی کوڕەکـەمان، ڕۆحێکی شەڕانگێز نەبووە شاکر گیان، تاکو عەزاب بدرێت.

شاکر: حەسەن گیان من مەبەستم خراپ نییە.. هەمووممان پێویستیمان بەرەحمەت و لێبوردنی خوا هەیە..

حەسەن: حامید خاوەنی چاکەو پیاوەتی بـوو بەسەر هەموومانەوە.

شاکر: کەس نکوڵیی لەچاکەی ئەو ناکات، بەڵام ئەو پیاوە، خوا لێی خۆش بێت ، بازرگان بوو.

حەسـەن: ئـاخر بازرگـانێکی ئـەمین و شـەریف بوو.. فێڵی لەکەس نەئەکرد.

شاکر: حاڵی بازرگان وەك حاڵی هـەموو بەشـەر وایـەو، ڕەنگـە جیـاوازیش بێـت لـە خـەڵکی غـەیری خۆی.. بەدەر نییە لەهەڵەو کەم و کوڕیی.. خـواش نەبێت کەسی تر لەکاری غەیب نازانێ..

حەسـەن: مـن لەهـەموو کـەس باشـتر برازاکـەم ئەناسم.. خۆم بەخێوم کردووەو فێری ڕاستگۆییم کردووەو، پاشانیش ئەو نموونەی دەست پاکیی و ڕەوشت و..

شـەریف: (قسـەکەی پـێ ئـەبڕێت) حەسـەن لەسـەرخۆبە ئـەوەی ئـەو پیـاوە ئـەیڵێ وایـەو ڕاستە.. ئادەی شاکر ئەو قورئانەم بدەرێ.. ( شـاکر قورئانەکـەی ئـەداتێو دواتـر فانۆسـێك هەڵئەکات و.. لەکاتێکدا تـاریکیی بـاڵ بەسـەر ئـەو ناوەدا ئەکێشێ، شاکر فانۆسەکە لە نزیك شـەریفەوە دائەنێت.. شاکر دەست ئەکات بەخوێندنـەوەی قورئانەکـە بـەدەنگێکی نـزم، جـار بـەجارێ ئـەبێت دەنگـی سـۆزێك ئـەکات و بـەرز ئەبێتـەوە. شـاکر لەتەنیشـتیەوە دائەنیشـێ، بەملکـەچیو پیرۆزمەندییەوە گوێ ڕا ئـەدێرێ، دەنگـی شـەریف بەرز ئەبێتەوە):

" و جاء من اقصى المدينة رجل يسعى و قـال من يحي العظام وهي رميم، قل يحيها الذى انشأها اول مرة. وهو بكل خلق عليم"

شـاکر: {ئەڕوانێتـە سـەراپای گۆڕسـتانە ڕەشپۆشـەکە.. دواتـر بـەدەنگێکی بیسـتراو بـیر ئەکاتەوە}: بەڵێ.. بەتوانایەو توانای بەسەر هەموو شتێکا ئەشکێ.. باشە ئەگەر.. ئەگەر ئەم هەموو ئێسك و پروسکە زیندوو بکاتەوەو بەیەکجار پێست و گۆشـتیان لەبـەر بکـات و، ڕۆح و ژیانیـان تـێ بگـەڕێنێو، پاشـانیش ڕۆحـم بـەقوربانی بێـت، جارێکی تر و یەك کەرەت بیان مرێنێتەوەو منیش، تەنها من بیانخەمە گۆڕەوە.. نا.. نا.. ئەو هەموو شـتە بەتەنـها یـەك کـەرەت لەسـەرو وزەی سـەد گۆڕهەڵکەنەوەیـە.. ئـەی باشـە ئـەگەر، دەدە، یـان تەنانەت بیست بیست ڕۆژانە وا لێ بکات{ لەم کاتەدا حەسـەن گـوێی لێ گرتـووە} چ دەوڵـە مەندییـەکم بەنسیب ئەبێت.. چ دەوڵەمەندییەك!

حەسەن: دەوڵەمەندبوونێکی بێ سنوور.. بیر لەچیی ئەکەیتەوە ئەی چاوبرسیی ناشیرین

شـاکر: هـا ؟ نـا.. نـا.. ئەسـتەغفیرەڵلا.. ئەستەغفیرەڵلا.. من.. من.

حەسەن: تۆ پیاوێکی خراپەکاریت و برازاکەشم هەر لەبەر ئەوەی تەنها بازرگان بووە، بەخراپەکاریی تاوانبار ئەکەیت.

شاکر: من.. من.. هەروەك تۆ ئەڵێیت گەندەڵم.. هەتاکو سەر ئێسقان گەندەڵم.. خودایا لێم ببوورە، لە خەیاڵ پڵاوییو نیەتە خراپەکانم بم بەخشە، هەر تۆی کەلێبوردن و تەوبەکاریت قەبوڵە خودایا!

دەی.. دەیبابەرەو ماڵ ببینەوە.. بەرەو ماڵ!

حەسـەن: بـەرەو مـاڵی چـی هێشـتاکە لەخوێندنەوەی یەکـەمی قورئانەکـە نەبووینەتـەوە.. بەرەو ماڵی چی؟

شاکر: نا.. بەرەو ماڵ.. بـەرەو هـەر شـوێنێك.. تەنهاو تەنها بەو مەرجەی لەم شوێنە دەرچین.. ( قورئانەکـە دا ئـەخات)گـەورەم لەماڵـەوە هـەتاوەکو بـەیانی لەگـەڵتان ئەمێنمـەوە، ئـەو کاتەشـی نیـەت ساف ئەبێت، ئەوا خێری ئەم قورئان خوێندنە ئەگاتە هەموو شوێنێك.. دەی.. خێراکە، هەستە





شەریف: ئەتەوێ بەم پەلەپەلە چی بکەیت؟ بەم دەم و دەستە چیت لێ قەوماوە؟

شاکر: {کەل و پەلەکانی بەشپرزەییەوە ئەپێچێتەوە، گەورەم لەپێناوی تۆداو لەپێناوی مێرد منالەکەدا، تۆ بۆچی ئەتەوێ لەشەوێکی نووتەکدا ئەو مێرد منالە دووچاری سەرماو ئەهامەتییەکانی گۆرستان بکەیت.. مەگەر نازانیت مالْ لەهەموو شوێنێ زیاتر مایەی پشووی زیاترە.. دەی.. گەورەم ..دەی لێت ئەپاڕێمەوە..

ساجید: نا نا . لەباوکم جیانابمەوە بەتەنیا لێرە جێی ناهێڵم "

شاکر: کوڕم هەر جێی ئەهێڵی.. هەر ئەبێت بەتەنیاو بۆ خۆی جێی بهێڵێ.. گەر ئەمشەویش نەبێت، ئەوا سبەی هەر ئەبێ جێی بهێڵی.. ئێمە هەموو تەمەنی خۆمان بەدیار مردوویەکەوە، چەندە ئازیزیش بێ، بەسەر نابەین.

ساجید: ( دامێن گیری باپیری ئەبێت) نا..نا

شاکر: ئەی دایکت کوڕەکەم؟ کێ تەسەللای پێ ئەبەخشێ؟ کێ قەرەبووی ئەو زیانە گەورەیەی بۆ ئەکاتەوە؟ دەی ساجید گیان.. تۆ ئێستاکە پیاوێکی عاقڵیت و ئیتر منالْ نیت.. خۆت بدەرە دەست عەقڵی خۆت و ئەوەی ئەیکەیت چ سوودێکی نییە..تەواو بێ هوودەیە دەی (ئەویش و ئەوانی تریش ئەداتە پێش خۆی).

شەریف: پێ ئەچێت تۆ کەر بدەیتە پێش خۆت..ئەرێ بۆچی ماوەمان نادەیتێ، هەر هیچ نەبێت، فاتیحەیەك بخوێنین؟

شاکر: (بەپەلە)ئەلفاتیحا.. ئەلفاتیحا( هەموان بەبێ دەنگیی فاتیحاکە ئەخوێنن) لەماڵەوە، پاش

ئەوەی شێو ئەکەن و پاشان قاوەو چا ئەخۆنەوە، هێزێکتان تێ ئەگەڕێو ئەوجا هەتا ئەتوانن شەوبێداریی ئەکەن. مرۆڤ، پێش هەموو شتێك، خۆ لەئاسن دورست نەکراوە، هەتا بەرگەی ئەم هەموو مەینەتیو خەم و ئازارە بگرێت. هەر ئەبێت بخواو بخواتەوەو بۆ ماوەیەکیش بحەوێتەوە، نەك هەر برەتیو برەتی بێ ئەوەی پشوویەك بەجەستەی بدات.

شەریف: ئەوە چییەتی ئەڵێی لافاوە هاژە ئەکات.. بێ دەنگ نابێو ناوەستێ

حەسەن: {بەچرپەوە} ئەترسیت؟

شاکر: ئەترسم. بەڵێ ئەترسم ترسی ناودەروون وەك پرسێتی ناو گەدە وایە.. ئەیهاڕێت و ئەنکۆڵی ئەکات، دووریش نییە بیکوژێت و هەپرووتی بکات.. پاشان مەسەلەی ترس هەستێکی ئینسانییە. بۆچی بیشارینەوەو شەرمی لێ بکەین.. بەتەنها ئاژەڵە کە ناترسێ ئێ خۆ من.. من ئاژەڵ نیم. من . من مرۆڤم (دەنگێك کەلەتەقینەوە ئەچێت) ئای خودایا! {هەڵئەلەرزێ. هەمووان بەترس و لەرزەوە، رائەوەستن}.

شەریف: شتێك تەقییەوە.

حەسەن: ئەبێ چ شتێك بێت لەگۆڕستانێکی روتەن دا بتەقێتەوە

شاکر: رەنگە.. رەنگە کێلی هەندێ لەگۆڕەکان بێ،هارەیان کردبێ.

شەریف: ئەی چما کێلی گۆڕەکان بۆچی هارە ئەکەن؟ نا ..نا وا دەرئەکەوێ، پارچەیەك لەزەمین درزێتێ کەوتبێت.. وەرن.. وەرن بابەچاوی خۆمان ئەوە ببینین.

شاکر: {بەترسەوە} جا ئێمە هەقمان چییە بەسەر ئەوەوە؟ بۆچی ئەوە ببینین؟ سبەی.. کە رۆژ بووەوە هەموو شتێك روون ئەبێتەوە وەرن .. وەرن..

حەسەن: نە..ئەترسم ئەوە گۆڕەکەی حامید بێت، هارەی کردبێت

ساجید: گۆڕی باوکم؟ {بەرەو دەنگەکە ئەچێت}

شەریف: باشە بۆچی گۆڕەکەی حامید؟ {بەرەو لای کوڕەزاکەی ئەچێت} ئاگاداریە ساجید. چاوەڕوان بە ساجید

حەسەن: چونکە ..چونکە ئەو گۆڕە، تازەترینی گۆڕەکانە. یان لەبەر ئەوەی شاکر ..ئە..

شاکر:نا.. من نا سوێند ئەخۆم، من من

ساجید: (ئەقیژێنێ) ئاه. ئەوە باوکمە. گۆڕەکەی باوکمە.

شاکر: نا. مەحاڵە.. من بەچاکیی هەڵم بەستبوو.. من پیاوێکی شەریفم ..من

حەسەن: لەخوا بترسە.. لەخوا.. تەنانەت فێڵ لەمردووەکانیش ئەکەیت!

ساجید: باپیرە. مامە.. گۆڕەکە خاڵییە.. خاڵییەو کەسی تێدا نییە.

شەریف: خاڵییە؟ ئەی حامید؟ کوا حامید؟ ئاه.. کوڕەکەم.

{ دەست ئەکەن بەگەڕان}

شاکر: گۆڕەو شاریان داوە.. گۆڕەکەیان هەڵکەندووەو فڕاندوویانە.

حەسەن: ئەرێ تۆ بۆچی زمانی خۆت ناگریت؟ کێ مردوویەك لە گۆڕەکەی ئەفڕێنێ؟

شاکر: دوژمنانی. یان یان ئەفرەتێك. ئەفرەتێك لەئاسمانەوە.

حەسەن: ئاسمان ئەفرەتەکانی خۆی بەسەر تۆدا ئەبارێنێ تۆ یەکی خاوەن بیروڕای پیس و وەسوەسەی شەڕانگێز.

ساجید: (بەگریانەوە) ئاه.. ئەوەتانێ ئەو لێرەدایە.. لەچۆڵەوانیدا فڕێ دراوە.. کفنەکەشی سووتێنراوە.

(هەمووان بەرەو لای ئەو را ئەکەن)

شاکر: سووتێنراوە؟ نا نا ئەوە لەبەر ئاسەواری گڵ رەش داگەڕاوە.. سوپاسی خوا بکەن کە سەلامەتە

شەریف: خودایا! ئەمە یانیچی؟ چ نهێنییەك لەمەدایە

شاکر: نە نهێنی تێدایەو نە هیچ کەسێك نارنجۆکێکی فڕێ داوەتە گۆڕەکەوەو

حەسەن: ئەرێ تۆ ورێنەی چی ئەکەیت ؟

شاکر: ئەشێ.. ئەشێ وابێ ئەشێ ئەو کەسە بڕێ پارە یان تۆڵەیەکی لەئەستۆی ئەودا هەبووبێت یان ..یان ..نازانم چی.

حەسەن: ئەم هەموو قسە هیچ و پوچەی تۆ ئەیڵێیت، تەنها بۆ ئەوەیە کە ئەیسەلمێنیت گۆڕکەت باش هەڵنەکەندووە.

شاکر: بەخوا.. زیاد لەپێویست گۆڕەکەم هەڵکەندووە.

ساجید: ئەی کەواتە بۆچی؟ باپیرە گیان هۆی چییە ئەو گۆڕە هەرەس دێنێو

شەریف: (لەواق ورمانێکی زۆردا) هەر بەتەنها خوا خۆی ئەزانێت.

حەسەن: کوڕم زەوییەکە فشەڵە.. ئا زەوییەکە فشەڵە..

شاکر: بەڵکو زەوییەکە بەردینیشە.. شەڕ لەگەڵ تەوردا ئەکات { لەم کاتەدا حەسەن بەقینەوە سەیری ئەکات}

بەڵێ، بەڵی فشەڵە.. زەوییەکە فشەڵەو لەخۆیەوە هەڵئەوەرێ

حەسەن: (پشت ملی ئەگرێ) وەرە وەرە زەوییەکی رەقترمان بۆ بدۆزەرەوەو گۆڕێکی تازەمان بۆ هەڵکەنە.

شاکر: ( بەبارگرانییەوە) ئێستا؟ لەم شەوە رەشە سامناکەدا؟

حەسەن: ئەی خۆ لەچۆڵەوانیدا جێی ناهێڵیت؟ تۆزێ ترسی خوات لەدڵدا بێت دەی ..دەی.. {سەرەڕای ئەو ترسەی کەهەمووانی داگیر کردووە، دەست ئەکەنە گەڕان گۆڕێکی تازە هەڵئەکەنن}.

شاکر: هەڵیگرن لەگەڵما. چی بکەین خوایە(تەرمەکە هەڵئەگرن).. نا.. ساجید.. نا، مەلەرزە، تۆش \حەسەن.. خۆت بگرە.. دەنا.. دەنا..ئاه شەریف.. لەترسا مەلەرزە. ئەوە ..ئەوە ..کوڕی خۆتە.. مەترسە..لێی مەترسە.

حەسەن: تۆ لەهەمووومان زیاتر ئەترسیت ئەی ترسنۆك.. واز لەورێنەکانت بهێنەو خۆت بگرە.

شاکر: من سەدان گۆڕم هەڵکەندووە سەدان مردووم ناشتووە روویئەداوە گۆڕێك ئاوا لەراکشاوەکەی ناوی راپەریبێ و فڕێی دابێتەوە دەرەوەو، هەروەها هەرگیز رووشی ئەداوە مردوویەك لەگۆڕەکەی یاخی بوبێت.

(شۆڕی ئەکەنەوە ناو چاڵەکەو گڵەکەی بەسەرا ئەدەن)

ئەم جەستەیە سووکە، زۆر سووکە، ئێوە سەرنجتان داوە.. لای من وایە پوشێکم هەڵگرتبێ، یان.. یان سوپاس بۆ خوا ئەڵێی هیچم هەڵنەگرتووە.. سوپاس بۆ خوا..دەی.. دەی خێرا کەن.. با بڕۆین، ئەم گۆڕستانە جێ بهێڵین.. پێش ئەوەی شتێك رووبدات.. نۆه. ئەفرەت.

حەسەن: شاکر چیی رووبدات.

شاکر: هیچ شتێك حەسەن.. هیچ شتێك. تکات لێ ئەکەم... تکات لێ ئەکەم وازم لێ بێنە.. رەحمم پێ بکە سەرکۆنەم مەکە لەسەر هەر وشەیەك لەزمانم ئەترازێت. وام لێهاتووە ورێنە ئەکەم. ئەئەوەیە ببوورێمەوە، نە ئەوەشە بزانم چیی ئەڵێم، هەمووشی بەهۆی ئەوەوەیە.. بەهۆی ئەو زمانە بەرەڵلایەی کەدەسەڵاتم بەسەریا نەماوە..هانێ، ها ئەوەتا بیبڕەو ، رزگارم کە لێی.

شەریف: لا حول ولا قوة الا باللة. ئەم پیاوەخەریکە شێت ئەبێ.

شاکر: نا بەڵکو شێت بوم و براییەوە.. عەقڵم تێکچوەو بەراستی شێت بووم.. تکات لێ ئەکەم وازم لێ بێنە.. لێت ئەپاڕێمەوە. ئەوەتا تۆ لەمن گەورەتری .. لەمن عاقڵتری ..تۆ.. { هەمان دەنگ ، هەمووان بێ دەنگ ئەکات} ه ه ئاه. نا. نا {هەوڵی راکردن ئەدات، قاچەکانی بەیەکدا دێن. ئەکەوێو خۆی ئەگرێتەوەو هەڵئەلەرزێ.. هەڵئەستێتەوە. جارێکیتر پەرش ئەبێت و ئەکەوێتەوە. کۆمەڵێ نیشارەتی بێ دەنگ ئەکات..}

ح.ح حا حا ..مد .حا.

ساجید: ب با با .ب (لەتاو ئەم هەڵوێستە کت و پڕە بەدەمدا ئەکەوێ).

حامید: {هەنگاو بەرەو لای ئەوان ئەنێ..ئەڵێی جەستەیەکی فڕیوە. هەردوو قاچی زەوی ناگرن. بەکفنەکەیەوە کەچەند پەڵەیەکی رەشی پێوەیە، بەئاسکیی نیشارەتیان بۆ ئەکات و زەردەخەنە ئەیگرێ بۆیان ..هەوڵ ئەدات سەدمەکەیان کەم کاتەوەو ترسیان برەوێنێتەوە) باوکە ..من.. حا.. میدم من

شەریف: {پەلاماری ساجید ئەدات بۆ ئەوەی هێزێك لەترسی ئەوەوە لەناو ناخی خۆیدا دروست بکات و رابکات} خودایا ..نا نا

حەسەن: { لەشوێنی خۆیدا هەڵئەلەرزێ. حامید بەرەو رووی ئەچێت، ئەویش. ئەویش رائەکات. بەترسێکی زۆرەوەهارە ئەکات و ئەکەوێو هەڵئەستێتەوە)خودایا.. رەحمەتی خۆت.

{بەتەنهاشاکر بەهەڵکورماویی ئەمێنێتەوە. ئەو کاتەشیحامید لێی نزیك ئەبێتەوە، ئەویش بەسنگە خشکێ هەڵدێت}.




## دیمەنی دووەم

{هۆڵێك پڕە لەکەل و پەلی ناو ماڵو نیشانەی دەوڵەمەندییــــە پەنجەرەیـــەك پـــەردەكانی دادراونەتـــەوە. لـەلاوە دەرگایـەك بـەرووی دەرەوەدا هەیە. دەرگایەكی‌تر بەرەو ناوەوەیە. دەرگای سێیەم بـەرەو رووی بینەرانە. سـەلماو سەعدیەو بەسمـە، هەرسـێكیان رەشپۆشـــن و شـــەكەت و مـــاندوو و غەمگین و مەینەتبارن}.

سـەلما: { لەپەنجەرەكـەوە سـەیر ئـەكات} دوا كەوتن. (دێتەوە ئەملاوە) پیاوان دواكەوتن.

سەعدیە: بەسمـە: پارووییـەك نـان بـۆ ئامۆژنی خۆت ئامادەكە. هـەر ئـەبێت شتێك بخوات ئـەگینا خۆی بەو برسێتی‌یە ئەكوژێ.

سەلما: نا..نـا..ئـەو پـاروووە مەگـەر ژەهـر بێـت كەدوای حامید بچێتە گەرووی منەوە.

سەعدیە: بەسمە:گوێی لێ مەگرە.. تۆش ئەبێت نـان بخۆی. پیاوەكـانیش كـە ئەگەڕێنـەوە برسـی‌و هیلاكن (بەسمە ئەچێتە دەرەوە).

سەلما: پیاوەكان؟ كوان پیاوەكان.. قـەت رووی نەداوە خەڵكی تاكو ئەم كاتە لەگۆڕستان بمێننەوە.

سەعدیە: ئەتەوێ چی بڵێیت؟

سەلما: دڵێكـی ئـەنجن كـراو چـی لەدەسـت دێ كەبیڵێ زیاد لـەوەی رووی تێ‌بكاتـە خواوەنـدو لێی بپاڕێتەوە ئەوانە بپارێزێت كە لەماڵەكەدا ماون.

سەعدیە: خوا یارمەتیت بدات.. خوشكێ گیان، حامید خۆری هەموومان بوو.

سـەلما: خۆرەكـەشمان ئـاوابوو. ئێمـەی خسـتە شەوێكی درێژ درێژەوە .. ئاخ

سـەعدیە: خوشـكێ گیـان وا مـەڵێ.. شـەریف خـۆرو روونـاكی ماڵەكەیـەو بـە ئـیزنی خـوا هـەر بەهەڵهاتوویی ئەمێنێتەوە.

سـەلما: دوای كوژانـەوەی حـامید؟ نـا .. نـا..

سەعدیە .. نـا .. تـۆ شـەریف ناناسیت.. ئـاخ.. شەریف وەك درەختێكی پیری لێ هاتووە كەڕەگەكانی لێی بڕابێتنەوە .. (ئەگری)

سەعدیە: ئەزانم كۆستەكەت چەندە گەورەیە.. هیـچ وشـەیەكیش نییـە لەقورسـایی ئـەو كۆسـتە كەمبكاتـەوە.. بـەڵام خوشـكێ دڵشـكاو مەبـە. لەرەحمەتی گەورەی خوا دڵشكاو مەبە.

سەلمـــا: ئەگـــەر وەك خـــەڵكی‌تر پـــاش نەخۆشییەكی چەند مانگە .. یان تەنانـەت چـەند هەفتە یاخود چەند رۆژە بمردایە، ئەوا لەسـەر ئـەم دەستانەی خۆم هەڵم دەگرت.. بەسۆزی خۆم ئـاوم دەدا.. دەنكی دڵی خۆم پێ ئەبەخشی‌و بەشەو و بە رۆژ شـەونخوونیم بـەدیارەوە ئەكێشـا.. ئەوسـا خەمەكە كەمتر ئەبوو.. بەڵام ئەوێك بەوپەڕی لـەش سـاغیەوە، بـەیانی بچێتـــە دەرەوەو، كـــەچی نیوەرۆكـەی، تـەرمێكی شـەلاڵ بـوو لـەخوێنم بـۆ بگەڕێتـەوە، ئـەوەیان لەسـەرووبەرگەگرتنەوەیە.. لەسەروو بەرگـەگرتنی دڵـی دایكەوەیـە (بەسنگی خۆیدا ئەكێشێ)

سەعدیە: ئیرادەی خۆیەتی، هـەر ئیرادەی خـوا خۆیەتی لەوەی رووی داوە.

سـەلما: ئـەو هـەرگیز هێنـدە لاواز ئـەبوو هەمیشە بەهێزو خۆگربـوو.. لـەناو دەیجووریشدا ڕێگەی خۆی ئەدۆزییەوە.. لەخراپترینی لەحزەكاندا ئەیزانی ئەبێ چی‌ی بكات.. بۆ وای لێ هات، بۆچی ئەو هەموو عەقڵە جوانەی لەدەست داو وای‌كرد.. ئا .. تەنانەت ناتوانم ئەوەی كردی بەسەر زمانما بێت.. ئای چ كارێكی ناڕەوای بەخۆی كرد

سەعدیە: كارەساتەكە عـەقڵی پـێ لەدەسـت دا ..كارەسـاتی سـووتانی هـەموو هـەوڵ و كۆششـی تەمەنی بەیەك كەرەت.. لەدەست دانی ئەو سەروەتە زۆرو زەوەندەیەی لەچەند دەقیقەیەكدا، هەژاندی

سـەلما: ئـێ باشـە خـۆ ئـەو سـەروەتە زۆرو زەوەندەیـە، هـەر خـۆی بەدەسـتی هێنـابوو، هـەر خۆشی ئەو هەوڵ و كۆششە زۆرەی بۆ پێكەوەنانی كردبـوو.. بۆیـە ئەگـەر بژیایـە هـەموو شـتێكی ئەگەڕاندەوە شوێنی خۆی.

سەعدیە: لەلەحزەی شێت بوونیـا كێ پـەنا بـۆ عەقڵ ئەبات.

سەلما: ئەو.. ئەو .. ئەبوایە ئەو پەنای بۆ عەقڵ ببردایەو ئەیهێشتایە بروخێت .. ... ئـاخ.. ئـاخ.

سەعدیە: خوشكێ گیان خۆت ئەموەن كـەرەوە.. چ سوودێك لەئەشكەنجەدانی رۆحی خۆت ئەبینیت؟

سەلما: رۆحـم چۆڵ بـووە، دڵـم چۆڵ بووە ماڵەكـەم چـۆڵ بـووە.. ئـاخ، چـۆڵ بـوون چـەندە ناخۆشـــە!چـــۆڵ بـــون چـــەندە ســـەختە! ئـــەو كۆرپەلەیەشی كەلـە منـاڵدانی بەسمەدایە، ئەویش لەچۆڵـەوانیدا، بـێ بـاوك.. بـەڵێ بـێ بـاوك لـەدایك ئەبێت.

سەعدیە: تۆ باوكی ئەوێت.. شەریف باوكێتی.. خوشكێ گیان دڵشكاو مەبە.. ئێمە هەموومان دایك و باوكی ئەوین .. {لەدەرگا ئەدرێ.. یەپەلە ئەچێ بیكاتەوە} زۆر دواكەوتن ئەرێ چی‌ی رووی‌داوە؟

حەسەن: {پالێكی پێوە ئەنێ} بێ دەنگ بە.. بـــێ دەنـــگ بـــە( شـــەریف دێتـــە ژوورەوەو ساجیدی‌لەباوەش دایە)

سەعدیە: {بەشڵەژاوییەوە} ساجید .. كوڕەكەم

سەلما: كوڕەكەم ئەوە چیتە؟ شەریف، سـاجید چـی‌ی بەسـەرهاتووە.. حەسـەن، ئـەوە سـاجید چییەتی.



بەسمە: ( بەترسێکی زۆرەوە دێتە پێشێ)
ساجید.. کوڕم ساجید..

شەریف: { پێ‌لەقەیەك ئەکێشی بەو دەرگایەی کەبەرەو رووی بینەرانەو لێوەی دێتە ئەمدیوەوە، ئەیەوێ لەدوای خۆی دای خاتەوە، بەڵام بەسمە تەکان ئەدات بیکاتەوە..سەبەلماو سەعدیەش بەدوایدا .. لەم کاتەدا حەسەن خۆی ئەکوتێتە سەر نزیکترین کورسی }

حەسەن: { لەناخەوە }
خودایا.. خودایا هەرتۆی پشت و پەنا هەر تۆی فریاد رەس.. نا ئەوەی رووی داوە کاری کردە نییە.. ئەبێ شتێ هەبێ لەکەونا لاسەنگ بووبێت.

سەعدیە: ( ئەچێتە دەرەوە) ئەرێ حەسەن ئەو کوڕە، ساجید چیی بەسەر هاتووە (حەسەن وەڵام ناداتەوە) وا بەو شێوەیە هەڵئەلەرزێ.. پێم بڵێ، لەوێ لەگۆڕستانەکە چیی بەسەر ئەوو ئێوەشدا هاتووە؟

حەسەن: مەگەر هەر خواکەت بزانێ چیی روویداوەو چیی تریش روو ئەدات ئاه..وازم لێ بێنە.

سەعدیە: ترساوە؟ لەتاریکیو گۆڕستانەکە ترساوە؟

حەسەن: ها؟ بە.. بە.. لێ بەڵێ ترساوە..

سەعدیە: زمانی بۆتە پارچەیەك قوڕقوشم، ناتوانێ بیجوڵێنێ، ئیشارەتی سەیرو بێ دەنگیش ئەکات.

حەسەن: ئاه.. ئەمەیە حاڵی کارەساتەکان.. کە دێن بەیەك کەڕەت و بێ بەزەییانە دێن.

سەعدیە: ئەی ئەو خۆڵە چییە بەروخسارتەوە.. هەروا روخساری شەریف و ساجیدیش رووخسارتان لەخۆڵ هەڵکێشاوە؟

حەسەن: نازانم ..نازانم.

سەعدیە: حەسەن وەڵامم بدەرەوە رامەکە. پێم بڵێ چیی رویداوە.. بەتەنێ ترس زمان لاڵ ناکات و، روخساری پیاوانیش بەخۆڵ رەنگ پەڕیو ناکات.. قسەبکە حەسەن.. قسە بکە

حەسەن: وازم لێ بێنە سەعدیە.. وازم لێ بێنە.. زمانت بپڕەو خۆت مەخەرە مەسەلەیەکەوە کە پەیوەندیی بەتۆوە نییە

سەعدیە: پەیوەندی بەمنەوە نییە؟ تۆ نازانیت چیی ئەڵێیت، چیی پەیوەندی بەمنەوە نییە، ئەوەی بەسەر مێردەکەم و براکەیدا دێت پەیوەندی بەمنەوە نییە.. نا .. نا دڵنیام تۆ خۆشت نازانیت چیی ئەڵێیت، حەسەن چیتە قسە بکە

حەسەن: ( هاوار ئەکات) نا..نا (بەشپرزەییەکی زۆرەوە رائەپەڕێ، سەعدیە بەنەرم و نیانیی ئەیخاتەوە شوێنی خۆی).

سەعدیە: حەسەن هێمن بەرەوە.. هێمن بەرەوەو راستییەکەیم پێ بڵێ.. تکات لێ ئەکەم.. تکات لێ ئەکەم..

حەسەن: گوێ بگرە سەعدیە.. واچاکە ئەم ماڵە جێ بهێڵین..

سەعدیە: ماڵی براکەت و ماڵی خوشکەکەم..

حەسەن: بەڵێ ماڵی براکەت و ماڵی خوشکەکەم.. مەبەستمە بڵێم ماڵی براکەم و ماڵی خوشکەکەی تۆ.. هەر ئێستاش.

سەعدیە: دوای ئەوەی ئەم هەموو کارەساتەیان بەسەر هات..

حەسەن: ئەی لەبەرامبەر ئەم کارەساتەدا چیت لەدەست دێ بیکەیت.

سەعدیە: ئەوەیە کە نەهێڵیت کارەساتی هەرە گەورەیان بەسەربێت، کارەساتی ئەوەی هەست بکەن تەنیان، هەست بکەن نزیکترین کەس لێیانەوە، خوشك و برا چارەی ئەوانی ناوێت.

حەسەن: کارەساتی  هەرە گەورە بەرێوەیە. هەر ئەبێ رووبدات

سەعدیە: پیاوەکە تۆ باسی چیی ئەکەیت؟

حەسەن: بەقسەم بکە سەعدیە.. بەقسەم بکە.

سەعدیە: ئەی ئەو کارەساتەی باسی ئەکەیت، تۆ ئەتوانیت واز لەبراکەت بهێنی کەبەتەنیا ڕووبەڕووی ببێتەوە   ئەگەر ئەتوانیت، ئەوا بڕۆ. خۆت بەتەنیا بڕۆ.

حەسەن: بەتەنیا خۆم؟ئەی تۆ؟

سەعدیە: هەر چییەك ڕوویدات، پێش ئەوەی پرسەکەی تەواو ببێت و برینی ئەمانیش سارێژ ببێت، من بەجێیان ناهێڵم.

حەسەن: پرسەی بۆ ناگیرێت، برینەکەشی قەتماغە نابەستێ‌و سارێژ نابێت، بەڵکو هەموو ڕۆژێك خوێنی لێ ئەتکێ‌و چڵکی خوێی تێ ئەکرێت  { لەکاتێکا سەعدیە سەرقاڵی گوێگرتنە لەقسەکانی حەسەن، ئەم بەئیشارەتێك سەرنجی بەلای بەسمەدا ڕائەکێشێ} بڕوانە  بڕوانە{ سەعدیە ئاوڕێك ئەداتەوە، بەسمەلەحاڵەتێکی سەیردا بەدی ئەکات}

بەسمە: { وەك ئەوەی بورابێتەوە} ون بوو  کوڕەکەم ون بو.. مێردەکەم ون بوو.. تەمەنم، هەموو شتێك ون بوو.. ون بوو.

سەعدیە: { خێرا بەرەو لای بەسمە ڕائەکات} بەسمە.. کچم، بەسمە.

بەسمە: لەتوانای کام پزیشکدایە، چەندە زیرەکیش بێت، گوڵدانێکی تێك شکاو چاك بکاتەوە یاخود ژیان  بکاتەوە بە بەری گوڵێکدا  کە هەلا هەلا بووە. مەحاڵە  مەحاڵ  {ئەچێتە دەرەوە.. سەعدیە هەوڵ ئەدات شوێنی بکەوێ، حەسەن بەتوندی ڕای ئەکێشێ}.

حەسەن: گوێ بگرە سەعدیە..

سەعدیە: ( بەتووڕەییەوە) نا.. بەڵکو تۆ گوێ بگرە حەسەن.. هەر چییەکت وت، لەبیر خۆتی بەرەوە، وەك چۆن من لەبیر خۆمی ئەبەمەوە، لەکاتێکا گەر ئەتەوێ وەك مێردێك شایانی ئەوە بیت کە ڕێزت لێ بگرم.

حەسەن: چۆن ئەکرێ مەسەلەکان بگەنە ئەم ڕادەیە؟

سەعدیە: بگرە لەم ڕادەیەش تێ ئەپەڕێ‌و، هەموو ڕادەیەك ئەبەزێنێ  بڕۆو دکتۆرێك بهێنە

حەسەن: دکتۆر؟ بەم شەوە.

سەعدیە: کوڕەکە پێویستی‌یەکی زۆری بەدکتۆر هەیە، ئەبێ گوڵدانەکەی بەسمە بچێتەوە دۆخی جارانی خۆی.

سەلما: {لە ژوورەکە دێتە دەرێ} حەسەن، ئەوەی براکەت ئەیگێڕێتەوە ڕاستە، یان عەقڵی تێك چووە{ (حەسەن ڕائەچڵەکێ‌و هیچ وەڵامێکی پێ نییە} وەڵامم بدەرەوە حەسەن  بۆچی بێ دەنگ ئەبیت

سەعدیە: ئەی شەریف هیچی ئەگێڕایەوە؟

سەلما: بەڵێ.. حەسەنیش ئاگاداری ڕووداوەکەیە.

حەسەن: نا  من هیچ نازانم..هیچ شتێك نازانم.

سەلما: بـا.. ئەزانیت و ، ئەوەی ئەو بینیویەتی، تۆش بینیوتە.

سەعدیە: سەلما، حەسەن کێ‌ی بینیوە؟

حەسەن: نا  نا  کەسم نەبینیوە.

سەلما: حەسەن لەژێر لێوەوە ورتە ورت مەکەو زمانت لێك ئەئاڵێ.. وا چاکە حەقیقەتەکە بڵێیت(حەسەن ئەشکەنجە ئەچێژێ) قسە بکە پێش ئەوەی بقیژێنم و ئەهلی شار کۆکەمەوە

حەسەن: کەواتە.. ئەوەی ئەو ئەیگێڕێتەوە ڕاستە؟ ( سەری ڕەزامەندی ئەلەقێنێ) کەواتە بۆچی پەلەتان کرد لەناشتنی؟ ئەی بۆچی لەوێ بەتەنیا بەجێتان هێشت.. ئاه  ئاه  ڕوو ڕەش خۆم کوڕەکەم، باوك مامت چییان بەسەر هێنایت

سەعدیە: (یەخەی سەلما ئەگرێ) سەلما پێم بڵێ  چی‌ی ڕوویداوە؟

سەلما: سەعدیە؛ حامید.. حامید  زیندووە.

سەعدیە: زیندووە؟

سەلما: بەڵێ ..بەڵێ، هەردووکیشیان بینیویانە، قسەی لەگەڵدا کردووە.. بەڵام ئەمان هەردووکیان ترساون ، لێ‌ی هەڵاتوون.. ئای چ نائومێدییەکە .. چ نائومێدییەك.

سەعدیە: حەسەن..خێراکە دکتۆرێك بهێنە برۆ، بەڵام بێ دکتۆر ئەگەڕێیتەوە (پاڵی پێوە ئەنێ)

سەلما: دکتۆر؟ بۆ من؟ گومان ئەکەی کەمن

سەعدیە: نا..نا.. خوشکێ گیان..تۆ نا..تۆ نا.. بەڵکو بۆ ساجید..

سەلما:ساجید باشە.. باشتریش ئەبێ لەو کاتەی کەچاوانی بەکلی بینینی باوکی ئەڕشت و بۆنی بەباوکیەوە ئەکرد.. بەقوربانی بم.. بەقوربانی هەردووکیان بم.

سەعدیە: { حەسەن هان ئەدات} حەسەن بجووڵێ. پیاوەکە بجووڵێ..

حەسەن: چی تر لەتوانای قاچەکانمدا ئەماوە هەڵم بگرن  سەعدیە بەزەییت پیاما بێتەوە.

سەلما: ئەی لەوێ..خۆ لەوێندەرێ دوو قاچی بەهێزت پێوە بوون  بەڵکو وەك ئەسپی پێشبڕکێ چوار ناڵەتان ئەکردو ئەو کوڕەتان لەوێ جێ‌هێشت. وەك جرجی ترساو بۆ کونەکانی خۆتان هەڵاتن ئێوە چ پیاوێکن..چ پیاوێ  دەی سەعدیە، هەستە با بڕۆین بۆ لای

سەعدیە:بۆ لای کێ؟

سەلما: ئای.. ئەڵێ بۆ لای کێ؟ بۆ لای حامید.. حامیدی کوڕم  ئاه  ڕۆڵەکەم، ئەبێ ئێستا سەرماو برسێتی چییان لێ کردبێت..دەی  دەی بابڕۆین { بەکێشی ئەکات}.

سەعدیە:ئەی ئەگەر.. ئەگەر تاکو بەیانی چاوەڕوان بین

سەلما: تۆ شێتیت؟ ئەتەوێ کوڕەکەم بەرووت و قووتی لەچۆڵەوانیدا واز لێ بێنم  برسێتی هەناوی بخوات و سەرماش چوار پەلی ڕەق بکاتەوە.

بەسمە: {دێتە ژوورەوە} ون بوو..کوڕەکە ون بوو.. مێردەکەم ون بوو.. تەمەنم

سەلما: نا  بەسمە گیان ، ئازیزەکەم نا  حامید ون نەبووە  حامید زیندووە. ساجیدیش ئەچێتەوە دۆخی جارانی خۆی

دەی.. دەی( ئەیداتە پێش خۆی‌و سەعدیەش پەلکێش ئەکات}.

سەعدیە: {پێش ئەوەی بچێتە دەرەوە} خێراکە بچۆ دکتۆرێ بێنە.. هەتاکو دێت زیاترمان پێویست پێیەتی.

حەسەن: { لەدەرگای ژوورەکەی شەریف ئەدات} شەریف  شەریف وەرە دەرێ

شەریف: ئەوە چ.. چییە حەسەن  کوڕەکە تازە چاوی گەرمکردووە.. چیت ئەوێ؟

حەسەن: ژنەکەت شێت بووە

شەریف: شێت بووە.. هاوار بەماڵم ..ئەی کوانێ؟

حەسەن: چوو بۆ لای حامید.

شەریف: بۆ ..بۆ لای کێ؟

حەسەن:بۆ لای حامید.. ئەرێ تۆ چیت بەسەرهاتووە.. ئەی نابیستی، بۆ لای حامید لەگۆڕستانەکە.

شەریف: ئاه  {ئەکەوێت}.

حەسەن: نا  نا  هەستە  هەستە با پێیان ڕابگەین و ئەهێڵین بچنە ئەوێ  ئاه  شەریف هەستە

{تاریکی}

## "فەسڵی دووەم"

### دیمەنی یەکەم

{ڕۆژی دواترە، کات ئێوارەیە.. هەمان هۆڵە. سەلما لەگەڵ ژمارەیەك ژندا خەریکی  قسەوباسە کە پێشتر دایمەزراندووە}

سەلما: بەڵێ.. بەڵێ.

ژنێك: ئەی قسەشت لەگەڵدا کرد.

سەلما:بێگومان ..قسەم لەگەڵیا کرد.. من ئەوم دواندو ئەویش دواندمی.

ژنێك :یەعنی.. یەعنی.. دەنگی لێوە هات. مەبەستم ئەوەیە گوێت لەدەنگی ، لەشەپۆلەکانی دەنگی گرت..

سەلما: کوێراییم دایە بۆ خۆی‌و بۆ دەنگیشی .. بەقوربانی‌بم، بەقوربانی دەنگیشی بم کەبەناسکی‌ی هەڵئەڕژا  ئەتووت چەند شەپۆلێکی گەرمی ڕووبارێکی بەهەشتین و لەو سەرما تووشەدا هەڵمیان لێ هەڵئەستا..سەرمای گۆڕستانەکە، ئەو سەرمایەی کە کێلە بەردینەی گۆڕەکانیش لەبەریدا هەڵئەلەرزین.. گەرمایی‌یەکی خۆش گەرایە گیانم؛ تەنانەت وام هەست ئەکرد لەناو جێگە  نووستنێکی گەرم و نەرمدام.

ژنێك: ئەی لەوە ئەترسایت کەڕووبەڕوو لەدیداری ئەو دایت..

ژنێکی‌تر:تۆ بڵێ‌ی دایکێك لەکوڕەکەی  بترسێت؟ ئەمە چ قسەیەکە تۆ ئەیکەیت خەدیجە.

سەلما: { دوای بێدەنگییەکی کەم}ڕەعشەتێك بەجەستەمدا گەڕا، لەبەری پێمەوە هەتا تەوقی سەرم.. پاشان ..پاشان هێندەی ئەبرد ئەو ڕەعشەتە

بووەلـەرزو دەسـتم كـردە لـەرزین      هـەر ئـەتوت درەختێكی لاوازی بەردەم زریانێكی توورەم. دواتر موچڕكەیەكم پیاداهات، هەروەك ئەوەی كەسێك بەرمیلێ سەهۆڵاو بڕژێنێت بەسەرما

ژنێك: هەر خوا یارمەتی داویت خوشكێ.

ژنێكی تـر: راستە ..راستە، ئاسان نییە ژنێك بتوانێ ڕووبەڕووی مردوویەك ببێتەوە.

ژنێك: بەڵام ئاخر مردووەكە كوڕی خۆیەتی خەدیجە

سەلما: (بەپەلە دێتە وەڵام) حامید، نەمردووە.

ژنێك: ئەی خۆ ئەو مردبوو.

سـەلما: نـەخێر هـەرگیز وانـەبوو     بـەڵكو سەرخەوێكی شكاندبوو، پاشان بەخەبەر هاتبوو.

ژنێك: خوای گەورە بەتوانایەو هێزی بەسەر هەموو شتێكدا ئەشكێ.

سەلما: كوڕەكە ڕەنگی بزڕكابوو      سەعدیەی ئامۆژنی وای وت     . ئێوە بڕوانن. ئامۆژنی ووتی، كوڕەكە     ئەگەر چی حامید تەمەنی لەسەروو سی ساڵیەوە بوو، خاوەنی منداڵێك بوو، یەكێكی تریشی بەڕێوەیە، بەڵام ئامۆژنی ووتـی كوڕەكـە.. ئای سەعدیە: خوا ڕەحمەت پێ بكات.

ژنێك: لەنەزەری دایكان و ئامۆژناندا، كوڕەكـان هەمیشە منداڵن، چەندە گەورەش بن.

سەلما: وەرە كوڕم . وەرە ئامێزی دایكتەوە لەكاتێكدا وام وت، پڕ بەگوێیەكانم وشـەكانی خـۆم بیست     هەستم كرد خۆم بەهێز ڕائەگرم..بەرەبەرە لەرزینەكـەم ئەرەوێتـەوە، بـەڵكو لـەوەش زیـاتر بەخۆڕاگریی لێی ئەچمە پێشێ‌و هەردوو باڵمی بـۆ ئەكەمەوەو سەعدیەش لەپشتمەوەیە     كەچی ئەو لەشـوێنی خۆیدایـەتی‌و بەهـەردوو چاویـەوە بـۆ كەسێكی ون ئەگەڕێ.

ژنێك: یاخود بۆ كەسێكی دیار ئەگەڕێ‌و ، كەچی لەگەڵ ئێوەدا نایبینێ.

سەلما: نا .. بەراستی وایە.. سەعدیە وتی ئـەو بەشوێن ساجیدا ئەگـەرێ .كـەچی بەسـە كـە بەدرێژایی كاتەكە بـەواق وڕمـاویی مـابۆوە، ئـەو چرپاندی: ڕەنگە     ڕەنگە بۆ من بگەڕێ".. وای وت و بەحەسرەتی ژنێكی دڵسـۆزەوە كـە مێردەكـەی خـۆش بوێـت بـەرەو ڕووی چـوو .. بـەڵام ئـاه     ئـاه. ئەو داماوە هاڕەی كردو بـەدەمدا كەوت. سەعدیە هاواری لەبەسمە كرد.. بـۆ ئاگـات لەو كۆرپەلەیەی ناو سكت نییە

ژنێك : ئـاه.. قوڕ بەسەر.. خوا لەم میحنەتـەیدا یارمەتی بدات.

سـەلما: مـن زۆر گوێـم نەدایـە بەسمـە.. بـەرەو ڕووی حامید بەهێواشی چووم، هاواری لێكردم، دایە بگـەڕێوە بـۆلای بەسمـە، ئـەو پێویسـتی بـەتۆ هەیە..من، جگە لەو گوێچكەو دڵم لەئاستی هەموو شـتێكدا نوقـاندبوو      لێی نزیـك بوومـەوە هەردوو باڵم هـەتا ئـەو پەڕییان كرابوونـەوە، وەك ئەوەی بمەوێ هەموو دنیا لـە باوەش بگرم.. ئـەو كاتەشی لـەئامێزم گرت، هەستم بەهێزێكی سەیر كـرد، هـێزێكی ئـەبینراو، لـەوەم دوور ئەخاتـەوەو باڵەكانم بۆ دواوە ڕائەكێشێ      بۆ یە دەستم كردە

گریان      كوڕەكەم، ئازیزەكەم.. هێزم پێ نەماوەو تواناى هەڵگرتنی جەستەی شەكەتم نەماوە، دەسا تۆ لێم نزیك بەرەوە.. لـەدایكت نزیك بـەرەوە ئـەی ئاقانەكـەی دایكـت      ئـەی هـەموو ژیـانی دایكـت. .بەڵام ئـەو دوور ئەكەوتـەوە، وەك كەسێك كەبەسـەر هـەوادا بـڕوات ئـاوا ڕێی ئـەكرد، ئـەی عـەمرت ئـەمێنێ سـەلما، ئـەوەتا لێـت دوور ئەكەوێتـەوە، سـەلما كوڕەكـەت لێـت دوور ئەكەوێتەوە، بجووڵێ      بانگی كە.. ڕاكە بەدواییدا..

ژنێك: ها     ئەی پێی گەیشتیت؟

سـەلما: هـەردوو بـاڵم جووڵانـد، هەستم كـرد لەحاڵەتێكی سروشتیدان      كەواتە چی ڕوویداوە؟ ئەی بۆچی باڵەكانم بۆ لەئامێزگرتنی ئەو بەقسەیان ئەكردم      ئـەو .. ئـەوی جگـەر گۆشـەم.. ئـەی چـۆن لـەمن هـەڵدێت.. بۆ ڕائەكات لێم.. بڵێی لەوە تووڕە ئەبووبێت كە من شـەوق و زەوقی بەسمـەم بـۆ ئـەو پێشێل ئەكردبێ و بەتەنیا هەوڵم دابێت هـەر خـۆم پێی بگەم؟

ژنێـك: ڕەنگـە.. هـەموو ژنێـك هـەقی خۆیـەتی بەمێردەكەی بكات.

سـەلما: ئـاه.. من چـەندە ژنێكی خۆپەرستم.. لەناخمدا ئازارێكی قووڵ درزی برد.. بەڵام بم بەخشە كوڕەكـەم.. داوای بەخشـین و لێبـووردن ئەكـەم بۆیە منی دایك بەرەو لای ئەو هەڵپەم كرد.. بەدوایدا ڕێـم ئـەكرد، ئەكەوتمـە چاڵـەوەو هەڵئەسـامەوە.. ئەكەوتم بەسەر بەردەكانداو هەڵئەستامەوە . بەسەر دركا، بەسەر گۆڕەكاندا، ڕام ئەكردو پاكم نەبوو چۆن پاكم هـەبێت كەلەبـەردەمما دڵم بـەدی بكـەم لەباوەشمـەوە دەربـاز ئـەبێ‌و لەدەستم هـەڵدێت تەنانـەت سـەعدیە هـاواری لێكـردم: سـەلما؛ بگـەڕێوە    . بەسمـە خوێنـی لەبـەر ئـەڕوات بەهەناسـەی سوارەوە هـاوارم كـرد، منیش خوێنم لەبەر ئەڕوات، هەروەها حامیدیش ..لەناكاو حامید وەستا، هەموو گیـانم بـەدەنگی ئـەو هـەژا     پـێی ووتم: دایكـە بگـەڕێوە بـۆ لای بەسمـەو منداڵەكـەی ..بگـەڕێوە     منیـش بـەدەنگێكی كـپ و بەپاڕانەوەیەكی پڕ لەحەسرەتەوە هاوارم كرد: ئەی تۆ كوڕەكەم ؟ ئەی تۆ ؟ گوێم لەهەناوی خۆم بوو كە چۆن سەدای دەنگە بەسۆزەكەی و بەڵێنەكـەی ئـەو ئەداتـەوە..دایكـە گیـان.. ئەگەڕێمـەوە، ئـا، ئەگەڕێمەوە     {لەم كاتەدا ورتە ورتێكی هێواش كەوتـە نـاو ژنانـەوە، ئـەویش بەسەراسیمەیی‌یەوە لەكەسێكی ونی ئەڕوانی}

ژنێك: ئەگەڕێتەوە؟ بۆ كوێ ئەگەڕێتەوە؟

سەلما: بۆلای دایكی.. بۆ ماڵەكەی.

ژنێك: بەڵام خۆ ئەگەڕایەوە..

سـەلما: هـەر ئەگەڕێتـەوە..حـامید لەبـەڵێنێك پەشیمان نابێتەوە كەدابێتی.

ژنێك: هەموو ڕۆژەكەت لە گۆڕستان بەسەر برد و كەچی ئەو هەر دەرنەكەوت.

سـەلما: دەر ئەكـەوێ‌و ماڵەكـەم و دڵـم پـڕ ئـەبن لەئەو و لێوان لێویش ئەبن لەخۆشەویستی‌و سۆزی.

ژنێك : (بەچرپە) شێت بووە.

ژنێكی‌تر: هەمووی وەهمە.

سەلما: بەڵكو حەقیقەتە، وەك حەقیقەتی بوونی تۆ لەبەردەممدا. ئەمەش بەڵگە كانێتی لەسەر دەم و چاوم     بڕوانە.

ژنێك:ئەوە ئاسەواری لەخۆدان و خۆڕنینەوەیە.

ژنێكی‌تر: تەنانەت ئەگەر وەهمیش بێت، لێگەڕێ با ژنەكە پەنای بۆ بەرێت.. با ئازارەكانی سووك بكات     تۆ بۆچی دڵرەقتری لەهەموو ئەو شتانەی گەماڕۆیان داوە.

ژنێك: باوكیشی نكوڵیی لەم هەموو قسەو باسانە ئەكات.

سەلما: باوكی لە زمانە بەدەكان ئەترسێ..ئەو زمانانەی وەك چەقۆ وان و ڕەحم ناكەن.

ژنێك: ئەی تۆ؟

سەلما: من، وەك دایكێك لەپێناوی كوڕەكـەی و ڕاستگۆیی خۆیدا، بەرگەی هەموو شتێك ئەگرم.

ژنێك: دایكێك..عەقڵی تێك چووە.

سەلما: عەقڵی من تێك چووە خەدیجە، یان دڵی تۆ كەلە هەموو باوەڕێك خاڵیە.

ژنێك: توخوا كێ باوەڕ ئەكات كە پیاوێ هـەموو مـافی خـەڵكی زەوت كردبێـت و فـڕێی دابنـە نـاو كەندەڵانی هـەژاریی‌و ناو كەڵبـەی برسـێتیەوە، كـێ باوەڕ ئەكات ئەو پیاوە ببێتە فریشتەو ببێتە خدری زیندەیەكی تـر     لەگۆڕەكـەی بێتـە دەرێ‌و بەسـەر هەوادا بڕوات و

سەلما: ( قسەكەی پێ ئەبڕێت) كوڕەكەی من؟ تۆ باسی حامیدی كوڕم ئەكەیت؟

ژنێك: ئـەی كـێ بـوو دوكـانی مێردەكـەمی هـەڵ لووشی، ئەو دوكانەی كەتاقە سەرچاوەی بژێویمان بوو، ئەو بوو دوكانەكەی ئێمەی خستە سەر كۆگا گەورەكـەی خـۆی كـە هـەتا ئـەهات لەسە ڕحسابی دوكانە بچكۆلەكان فراوانتر ئەبوو، بەدبەختی‌ی ئەو خاوەن دوكانانەش لەوەدا بوو كە دراوسێ دوكانی ئەو بوون

سەلما: درۆزن! تۆ درۆزنیت خەدیجە      قسە بۆ كوڕەكـەم هەڵئەبەستیت، ئـیرەیی‌و حەسـادەتی پـێ ئەبەیت. لەماڵەكەم بڕۆ دەرەوە.. دەی.. بڕۆ دەرەوە..

{شالاوی بۆ ئەبات      ژنەكانی‌تر ئەیگرن}

ژنێك: عەیبە دایكی حامید.. عەیبە..تۆزێ عـەقڵ بهێنەوە بەرخۆت.

سەلما: (خرۆشاوە) ئێوە هەمووتان درۆزن و دوو زمـانن.. لەمەوبـەریش سـەرنجی گاڵتـەجاری و سووكایەتی‌پێكردنم لەچاوە ناشیرینەكانتانا داوە.. گاڵتە جاڕی بەهەموو ئەو شتانەی ئەیانڵێم، بەدڵی خوێناویم كەنوقمی ناو زامەكانی ئەبم و ڕاستگۆیی لێـوە دەرنـەهێنم      چونكـە درۆو بوختـان و دوو زمـانیی سـیفەتی ئێوەیـەو بـاوەڕ بەڕاسـتگۆیی ناكەن

ژنێـك: نـا.. نـا      ئەمـە زۆرە كـەتۆ ئەیڵێیت..ئەگەر تەقدیری حاڵەتی تۆم ئەدایە، لـەم ئیهانە كردنە بێ دەنگ نەئەبووم.

ژنێك: لێی گەڕێن..لێی گەڕێن      بابڕۆین..

سەلما: پێش ئەوەشی بڕۆن      باشتێكتان پێ بڵێم      حامیدهەر دێت و یەك بەیـەك ئـەی هێنمە لاتان



شەریف: { بەپەشۆکاییەوە خۆی بەژووردا ئەکات } ئەمە چییە؟ ئەوە چیتانە؟ ئاه تەنانەت لەم رۆژە رەشەشدا واز ناهێنن

سەلما: { دەست بەدامێنییەوە ئەگرێ } شەریف گیان راستییەکەیان پێ بڵێ، حامید زیندووە یان مردووە شەریف قسە بکە { شەریف بەسەر سوڕمانەوە بێدەنگ ئەبێت } قسە بکە قسە بکە حامید زیندوو نیە، ئەی تۆ ئەتبینی؟

{ شەریف هیچ قسەیەک ناکات، هەندێ لەژنەکان بەجۆرێك لەبەزەییەوە ئەچنە دەرەوەو هەندێکی تریان بەشەوقەوە } ئای شەریف چۆن خەجاڵەتت کردم خەجاڵەتت کردم، ئەی لەچاوی هەندێکیاندا روانینی بەشەوقت ئەبینی؟

شەریف: سەلما، ئەوانە دراوسێی ئەمەن پاشان هاتوون دڵنەواییت بکەنەوە

سەلما: دڵنەواییم بکەن بۆ کێ؟ بۆ حامید؟ حامید زیندووە.

شەریف: سەلما، هێور بەرەوە هێور برۆ بەلای بەسمەوە

سەلما: ( خۆی بەرەقیی ئەنوێنێ ) سەعدیەی لەگەڵدایە من ئەچم بۆ لای حامید ئەچم ئەیهێنمەوە بۆ ئەوەی ببێتە درکێك و بچێ بەچاوی هەر قین لەدڵ و حەسوودێکدا.

حەسەن: { دێتە ژوورەوە } سەلما خێراکە بچۆ بۆ لای بەسمە حاڵی زۆر خراپ بووە تەنانەت دکتۆرەکەش گێری خواردوە بەدەستیەوە دەی خێراکە ئەو داوای تۆ ئەکات { بەرەو ژوورەکە پاڵی پێوە ئەنێ }

شەریف: (بەلاوازییەکی زۆرەوە) حەسەن ئەرێ حەسەن، تۆ پێم بڵێ

حەسەن: بەڵێ براکەم

شەریف: ئەمەی بەسەر ئێمە دێت، پێش ئێمە بەسەر کەسی تردا هاتووە؟

حەسەن: باوەڕ ناکەم دوای ئێمەش بەسەر کەسی تردا بێت ئەی چار چیە شەریف ئێستا چی بکەین چۆن پێش ئەوەی کار لەکار بترازێ، چارەسەرێکی ئەم حاڵە بکەین

شەریف: تازە کات بەسەر چوو تازە زەمەن خۆی بەسەرچووەو هیچ بوونێکی نەماوە..

حەسەن: بەڵام شەریف، هەر ئەبێ بڕیارێك بدەیت تۆ پرسە دائەنێیت یان نا؟

شەریف: لەمن ئەپرسیت جا من ئەتوانم بڕیاری هیچ شتێك بدەم ئاه واهەست ئەکەم گەڵایەکی پاییزیم و هەڵوەریوم و رەشەبا یاریم پێ ئەکات ئەی سەلما هیچی ناوێت، تۆ هیچت ناوێت ئەی من من هیچم ناوێت تۆ پرسە بۆ گیانی برازا مردووەکەت دابنێ یا سەلماش کۆڕی خۆشیو شادی بۆ کوڕە زیندووەکەی بگێڕێ بەڵام من، هیچ نازانم ئاه چەندێ سەختە مرۆڤ نەزانێت چی ئەکات و داوای چیش ئەکات

حەسەن: ئەو ئازارەی هەڵیساوە هەر چۆنێك بێت، پێویستە ئێمە بەسەر خۆماندا زاڵ بین، بەتایبەتی لەم جۆرە حاڵەتانەدا

شەریف: بەسەرخۆدا زاڵبوون، ئا، ئەوە ئەو ئامانجەیە ئەو کاتەی‌من پێویستم پێیەتی، ئەو لەدەستم هەڵدێ، وەك چۆن هەوا لەسییەکانی کەسێکی نقووم بوو هەڵدێ براکەم، تۆ دەست بەکار بە دەست بەکاربە مادامەکی ئەتوانیت

حەسەن: خۆ منیش لەتۆ باشتر نیم ئەم صەدمەیە لەناوەوە کرۆشتمی بەهەزاران کرمی برسی لەناوەوە بنکۆڵم ئەکەن

شەریف: ئەی چارە چییە حەسەن؟ چارە چییە؟ { دەنگە دەنگ و هەراو زەنا لەدەرەوە دێ } ئەوەچییە؟

حەسەن: ( پەنجەرەکە ئەکاتەوە) شاکرە ئەوە شاکرە گەڕاوەتەوە. { لەپەنجەرەکەوە، ئەتوانرێ شاکر بەدی بکرێ سیمایەکی سەیری هەیە، لەنێو کۆمەڵێك مێرد منداڵدایە، خەریکی تەنەکە لێدانن، ئەویش لەناویاندا سەما ئەکات و گۆرانیی ئەڵێت }.

مێرد منداڵان( یان کوڕو کاڵان):-

ئەی شاکرە شێت واز لەهەڵکەندنی گۆڕەکان بێنە ئەی شاکر ئەی شێت مردنمان تێ مەگرە ئەی شاکر ئەی شێت برۆ لەناو گۆڕەکاندا ئارام بگرە

حەسەن:ئەرێ بۆچی بەدەورو پشتماندا دێت

شەریف: ئەی نازانیت بۆچی؟

حەسەن: رۆیشت دوورکەوتەوە کوڕوکاڵانیش شوێنی کەوتن.

شەریف: بەرەو گۆڕستانی بەرێ ئەکەن ئەوسا ئەو شوێنێ ئەوان ئەکەوێ ئەوە یارییەکی بێ کۆتاییە {وەك یەکێك خۆی بدوێنێ } وام لێهاتووە حەسادەتی پێ بەرم، خۆزگە منیش وام لێ ئەهات

حەسەن: سەعدون و حاجی سەلیم بەرەو لای ئێمە دێن.

شەریف: ( بێ بایەخ دان) چییان لەئێمە ئەوێت؟

حەسەن: دوو دراوسێ چییان لەسك سووتاوێك ئەوێت؟ دیارە هاتوون دڵنەواییمان بکەن.

شەریف: دڵنەواییمان لەکێ بکەن

حەسەن: لەکێ؟ لەو مردووەی دوێنێ ناشتمان

شەریف: ئەی بەراستی ئێمە مردوویەکمان ناشت

حەسەن:شەریف، ئەوە چیتە؟

شەریف: ئەی خۆت ئەتبینی ئەی لەهەردووکمان، یان هیچ نەبێت لەمن زیاتر ئەژیا

حەسەن: شەریف براکەم، ئامادەیە ناکرێ تۆ بەم حاڵەوە پێشوازیی لەخەڵك بکەیت ( شەریف بێ جووڵەیە، لەدەرگا ئەدرێ، حەسەن ئەیکاتەوە) بەخێربێن بەخێربێن.

حاجی:سەلامو عەلەیکم( دائەنیشێ) ئەلفاتیحا(ماوەیەك بێدەنگیی) ئەمە چییە بەرگوێمان ئەکەوێتەوە شەریف (شەریف قسە ناکات).

حەسەن: ( دەست پێشخەری وەڵامدانەوە ئەکات) خێرە ئینشائەڵلا هەمووی خێرە بەرووخسەتی ئێوە (ئەچێتە دەرێ)

سەعدون: ئەترسم چ خێرێك لەوەدا ئەبێت کە ئەیبیستین؟

شەریف: چیی ئەبیستن؟

حاجی: ئەو شتەی کە دوور لەپێش نزیکەوە ئەیبیستێ.

سەعدون: مەبەستت لەوەیە کە تۆ ئاگاداری ئەوەنیت چ قسەو باسێك لەماڵەکەتەوە دێتە دەرێ.

حاجی: ئەم ماڵە بۆتە کۆگەی هەموو ئەو پڕوپاگەندەو خورافاتەی کە دژ بە دەسەڵاتی خواوەند ئەکرێت.

حەسەن: { بەقاوەوە دێتە ژوورەوە } خوا لەهەموو پڕوپاگەندەیەکی خراپ بمان پارێزێت فەرموون برایان

سەعدون: ژنەکەی تۆ شەریف نا ژنەکەت پڕوپاگەندەی وا لەناو ژناندا ئەکات کەجەستەی مرۆڤی لەبەر هەڵئەلەرزێ.

حاجی:یەعنی چی حامید زیندووە؟ئەم درۆ هەڵبەستنە چیە لەبەردەم خواو خەڵکدا ئەی بەرەحمەت بێ من حامیدم بەدەستی خۆم ئەشۆرد خۆم کفنم ئەکرد ئەی پێکەوە ئەمان ناشت!

سەعدون: ئەی پێکەوە فاتیحەمان بۆ گیانی پیرۆزی ئەو دانەدا، ئەو کاتەی لەگۆڕەکەیدا راکشابوو ئێوەشمان لەگەڵدا بوون

حەسەن: راستە بەخوا وایە.

حاجی: پاشان ئەو قسەو باسانە، بیدعەیەکن، ئاین و عورف رەتی ئەکەنەوەو هەروەها عەقڵ و مەنتیقیش.

سەعدون: کەللەی پووتی ژنەکانمانی پڕ کردووە لەقسەو باسێك کە تووکی سەری پێ رائەوەستێنێت. لەوەتەی دایکی زەینەب لێرە گەڕاوەتەوە، لەناو جێگادا کەوتووە لەرزوتای ترس دایگرتووە.

حاجی: ژنەکەی منیش بەپرسیاری بەردەوام کاسی کردووم.

سەعدون: لەگەڵ رێزی زۆرمدا بۆ حاڵەتی ئەوو ئێوەش، ئەبێ بێدەنگ بکرێت.

حاجی: ئەم ژنە جاهیلە خراپە دەرهەق بەکوڕەکەشی ئەکات، بێ ئەوەی بەخۆی بزانێت یان هەست بەخۆی بکات. هەر بەتەنها رۆحە شەڕانگێزەکانن کە بەگوناه بارکراون وەك سزایەك گۆڕەوشار ئەدرێن.

حەسەن: ئەوجاهیلە بەراستی جاهیلە ئەبێ رێگەشی لێ بگیرێت و دەمی دابخرێت.

حاجی: ئەی‌بۆچی تاکو ئێستا پرسەتان بۆ دانەناوە؟ ئەگەر بەهۆی ئەو نەبوونییەوەیە کە تووشتان هاتووە، ئەوا من و موختاری برام، لەیەك فلسەوە تاکو هەزار، خەرجییەکەی ئەکەین.

سەعدون: گوێ بگرە شەریف تۆش حەسەن ئێمە دراوسێی عومرین، ئەزانین زیانەکەی ئێوە، زیانێکی بێ شومار بوو، تەڕووشکی پێکەوە سووتاند ئێمە لەخزمەتداین

شەریف: خوا جەزای بەخێرتان بداتەوە سوپاس بۆ خوا تاکو ئێستا حاڵمان باشە

حاجی: بەڵام خۆ ئەوە دوو ڕۆژ تێپەڕین ئەبوایە لەیەکەمین ڕۆژەوە خۆتان ئامادە بکردایە ئەم مەسەلانە هی ئەوە نین خاوە خاویان تێدا بکرێت بەپێچەوانەشەوە بواری فراوانتر ئەرەخسێنرێت بۆ ئەوەی قسەو باسی زەرەرمەند دژ بەناویانگت بوروژێنرێت تۆ بازرگانیت، سەرمایەی بازرگانیش ناوبانگێتی، ئەک پروپاگەندەو ئەو وەهمانەی کە لەزیان زیاتر قازانجێکیان نییە

سەعدون: ئەوە خەتای ئەو ژنە کەم عەقڵیە،



گەورەم ئەو لەخۆیەوە، لێرەو لەوێ، لەزەوییەکی بەیاردا وەهم ئەچێنێ و ئەوژنانەشی کەلەو کەم عەقڵترو نەفامترن، ئەیقۆزنەوە.

حەسەن: هەموو ئەو شتانە بەزووترین کات کۆتاییان دێ پێویست وابوو ئێمە لەبەردەم گەورەیی صەدمەکەدا خۆڕاگربین ئەمشەویش، ئینشائەڵلا ئەمشەو پرسەی بۆ دائەنێین وا نییە شەریف؟

حاجی: بەڵێ بڕیار بڕیاری تۆیە حەسەن هەر بەوەش ئەو زمانانە ئەبڕینەوە کە سومعەتان ناشیرین ئەکەن دەست درێژی ئەکەنە سەر پلەو پایەتان ئەو ژنە سک سووتاوە داماوەش لەو وەهمانە ئەهێننە دەرێ کە تیایاندا گینگڵ ئەدات

سەعدون: ئینشائەڵلا بەنیازن لەکوێ پرسەکەی بۆ دابنێین؟ لە مزگەوت یاخود

حاجی: لەمزگەوت مزگەوت خێری زۆرترو گەورەتریشە هەموو شتێك لەمزگەوت حازرو ئامادەیە و ئەوەش بەشێکە لەخێرو خێراتی خوالێخۆشبوو هەزار رەحمەت لەگیانت حامید

گیان، کورەکەم، لەهەموو بۆنەیەکدا پێویستییەکی دابین ئەکرد ئەمە سەرەڕای ئەوەی خواردن و جل و بەرگیشی بۆ فەقێ هەژارەکان لەمانگی رەمەزانی پیرۆزی هەموو ساڵێکدا دابین ئەکرد.

سەعدون: کەواتە رێك کەوتین لەسەر ئەوەی لەمزگەوت یەکتر ئەبینین. و ئینشائەڵلا ئەلفاتیحا،

حەسەن: ئینشائەڵلا ( پێشیان ئەکەوێ، دەرگاکەیان بۆ ئەکاتەوە. بەڵام لەپڕ وەك کارەبا بیگرێت، هێزێکی گەورە بەرەو دواوە پاڵی پێوە

ئەنێت) خودایا رەحمەتی تۆ (ئەکەوێت بەپشتا ) ئاه

شەریف: ( لەشوێنی خۆیەوە قەڵەمبازێك ئەدات) تەڵلاهی دڵم خەبەری دابوو ئاه کورەکەم( باوەشی بۆ ئەکاتەوە، کەچی ئەو لەجیاتی ئەوەی بێتە پێشێ، ئەچێتە دواوە) کورە نازیزەکەم

حاجی: حەسەن؟ ح ح نا { چاوی هەڵئەگلۆفێ ئەعوزوبیللا ئەکات ئەکەوێتە ترسێکی زۆرەوە }

سەعدون: ئەوە ، ئەوە ێ ێ ( هەندێ ئیشارەتی بێ دەنگی ترس و لەرزاوی ئەکات).

حامید: {لەناو دەرگاکەدا ئەوەستێت} م منم من من ن

حاجی: ئەوە قسەش ئەکات ئەی هاوار خوای گەورە {لە ژێرەوە وێرد ئەخوێنێ زۆر پەشۆکاوە نازانێت چی بکات}

{حامید دێتە ژوورەوە، کفنێکی پەڵە پەڵەی رەشی لەبەردایە، ئیمچە فڕینێك ئەفڕێ، بەرەو لای

دایکی ئەچێت، سەعدون قاچێك ئەکاتە دووان وحاجیش لەو خێراتر بەدوایدا، حامید بەچاوی بەزەیی و ئازارەوە تەماشایان ئەکات هاو کات هەریەکەلەشەریف و حەسەن ئەچنە ناو یەکترییەوە و گۆشەیەك ئەگرن هەڵئەلەرزن}

حامید: باوکە ئەوە منم حامید حامیدی کورت

شەریف: ( ئەگەرێتە دواوە) نا نا

حەسەن: { پاڵ بەشەریفەوە ئەنێ بۆ لای حامیدەوە بۆ ئەوەی خۆی بپارێزێت} نا

ئەوە خۆیەتی شە شەریف خۆیەتی.

شەریف: ئەوە رۆحەکەیەتی یان تارمایی ئەوە ناکرێ ئەوە ئەو بێت.

حامید: باوکە ئەوە چیتە؟ نکوڵی لەکورەکەی خۆت ئەکەیت

شەریف: د ئەم دەنگە، دەنگێکی وشکە ئەم شەپۆلی دەنگە،، هی کورەکەی من نییە.

حەسەن: پ پ پ پ رەنگە بەهۆی سەرماو سۆڵەوە بێت نا سەرماو سۆڵەی ئەوێ، هی گۆڕستانەکە.

حامید: باوکە مامە ئەوە چییە لەمن ئەترسن ئەی کەواتە من روو لەکێ بکەم؟ کێ ئەمپارێزێت؟

{لەم کاتەدا سەلما بەپەشۆکاوییەوە دێتە ژوورێ، لەسەرەتاوە ئاگای لەوە نییە کە حامید لەوێیە}

سەلما: ئەرێ ئەو دوو پیاوە لەچوونە دەرەوەدا خراپ بەیەکدا ئەهاتن، ئەتووت مردن راوی ناون کێ؟ حامید، حامیدی کورم من دڵنیا بووم کە تۆ



دێنێت وەرە کوڕەکەم وەرە ئامێزی دایکت، با ڕووی ئەو ژنە کافرانە هەر ڕەش بێت { بەخێرایی و بەشەوقێکی زۆرەوە بەرەو ڕووی ئەچێت و هەردوو باڵی بۆ ئەکاتەوە، لەپڕێکدا لەمەسافەی باڵێکدا لێوەی ڕەق ڕائەوەستێ } ئەوە چییە شەریف بۆچی ئەمگریت لێم گەڕێ با ماچی کەم، با بۆنی کەم

شەریف: ئەرێ ژنەکە کوا من لەتۆ نزیک کەوتوومەتەوە؟

سەلما: کەواتە ئەوە تۆی حامید گیان پاڵم پێوە ئەنێیت و ناهێڵیت دەستت تێوە بدەم وەك ئەو جارەی لەگۆڕستانەکە کردت بۆچی کوڕەکەم بۆچی تاکو ئەم ڕادەیە دڵڕەقیت بەرامبەرم؟

حامید: ئەوە من نیم دایەگیان ئەوە من نیم کە دڵڕەقیت بەرامبەر بنوێنم

سەلما: لەوێ، بەهۆی ئەوەی کەبەسەر بەسمەدا هات، تۆ لەمن پەست بوویت، هەقی خۆشت بوو بەڵام بمبوورە کوڕەکەم لێ گەڕێ باماچت کەم بۆچی ئەمدەیتە دواوە بڵێی خراپەم دەرهەقت کردبێت، گریمان کردوومە ئەوەتانێ، ئەوە منم، داوای لێبووردنت لێ دەکەم ئازیزەکەم.

حامید: دایکی‌ئازیزم تۆ هەمیشە باشترین دایک و هاوڕێ بوویت

سەلما: ئەی کەواتە ئەوەچییە؟ بۆچی وا هەست ئەکەم کەسێك هەیە پاڵم پێوە ئەنێ‌و لەتۆم دور ئەخاتەوەو ناهێڵێ دەستت لێوە بدەم

حامید: خۆزگە منیش ئەمزانی هێزێکی شاراوە هەیە لەشتەکانم جیا ئەکاتەوە ناشزانم نهێنییەکەی لەچیدایە.

شەریف: { ئیشارەت بۆ قاچی حامید ئەکات کە نزیکەی بستێك لەزەوییەکەوە بەرزبوونەتەوە، بەپەشۆکاوییەوە } یەعنی یەعنی

حامید: بەڵێ بەڵێ باوکە هیچ بەشێکی جەستەم بەر هیچ شتێك ناکەوێ لەتوانای هیچ شتێکیشدا نییە کە بەرمن بکەوێ دوو ڕۆژە ئەوە حاڵی منە

حەسەن: ئاه بۆ ئەم عەزابە سەختە کوڕم.

سەلما: هەقت نەبێ کوڕم هەقت نەبێ ئەم حاڵەتە نامێنێ من دڵنیام کە نامێنێ و بەسەر ئەچێت

حامید: بەسمە چۆنە؟ ئەی ساجید چۆنە؟ هەردووکیان باشن؟

سەلما: چاوەکەم ئەو لەمەراقی منالەکەی و مێردەکەیدایە ئێستا هەردووکیان بانگ ئەکەم

حامید: نا دایکە نا من ئەترسم هەردووکیان سڵم لێ بکەنەوە

سەلما: ئەم قسە سەیرە چییە حامید ئەوانە ئەوەندە بەشەوقن بۆ بینینی تۆ خەریکە ئەتوێنەوە.

حامید: ئاه نا { ئەیەوێ بیگرێت، ناتوانێت } ئاه باوکە مەهێڵە بانگیان بکات تکات لێ ئەکەم

شەریف: { سەلما ئەگرێت } سەلما، هەمووجارێ سوار سەری خۆت مەبە، گوێت لەکوڕەکە نییە

سەلما: نا نابیستم ئەو لەگۆڕستان لەنێمە هەڵات و، لێرەش نایەوێ بەسمە ببینێ بۆچی؟ (ئەچێتە دەرەوە)

حەسەن: مەخلوقێك نییە هێندەی ئەم ژنە کەللە ڕەق بێت

شەریف: کوڕەکەم حامید،پێم بڵێ تۆونێمە چیمان بەسەر هاتووە بڵێی خەون ببینین بڵێ مۆتەکە هاتبێتە سەر سنگمان ئەرێ تۆ مرۆڤێکیت لە گۆشت و خوێن یاخود تارماییت، تارمایییەکی لەهەوا دروستکراو پێم بڵێ خەریکە لەت و پەت ئەبم

حامید: باوکە، تۆ هەڵئەلەرزیت

شەریف:لەوەگەڕێ من لە چ حاڵێکدام و وەڵامم بدەرەوە من گوێ بیستی تۆم

حامید:بەڵام ئێوە خۆ گرین هەر ئەبێت خۆگرین بۆ ئەوەی دەرك بەوە بکەن من لە چ حاڵێکدام

شەریف: ئاه ئاخر چۆن خۆگربین لەکاتێکدا ئەوەی ئێمە بەدیی ئەکەین، مرۆڤێکی‌تر بەدیی نەکردووە.

حامید: باوکە، تکات لێ ئەکەم یارمەتیم بدە مەهێڵەتانەبەد ئەم سزا سەیرە هەڵگرم و لەو عەزابانەیدا بژیم کەشاخ لەئاستیاندا هارە ئەکات

شەریف: کوڕم من ڕۆحی خۆم ئەکەمە قوربانی‌تۆ پێم بڵێ، ئەبێ من چیبکەم تەنها پێم بڵێ‌و بەس

حامید: ئیتر دەنگم پێت نامۆ نابێت

شەریف: دەنگت دێتە ناو دڵمەوە لەپەڕەی دڵماناڕامی گرتووە بەڵام چیبکەم عەقڵی نابەکامم هەتاکو ئێستاش توانای نییە

حامید:عەقڵیشت پێم ئاشنا ئەبێت ئێستاکە بەتەنها دڵە گەورە بەسۆزەکەتم بەسە

حەسەن: کوڕم ئەوەندە ئەو کاتە بەفیڕۆ مەدە کە ئێمە زۆرمان پێویست پێیەتی قسە بکە پێش ئەوەی دایکت بگەڕێتەوەو لەشەپۆلی وڕێنەکانی خۆیدا نقوممان بکات {حامید ئەیەوێ قسە بکات}

شەریف: {بێدەنگی ئەکات} بێهوودەیە ئەوەتا زریانەکە هاتەوە{سەلما لەگەڵ ساجددا دێنە ژوورەوە}

سەلما: وەرە ژوورێ ساجید وەرە ژووری باوکت گەڕاوەتەوە بەسمە: تۆش وەرە وەرە

حامید: ساجید کوڕە ئازیزەکەم{ بەشەوقەوە بەرەو ڕووی ساجید ئەچێ، کەچی بێ توانا ئەوەستێ} ئاه خودایا

ساجید: با ب ب { بەرەو ڕووی باوکی ڕائەکات، ناتوانێ دەستی لێوە بدات} ب ب { ناتوانێ قسە بکات}.

شەریف: تۆ ئەمەت ئەویست سەلما ئەمە دیمەنێکە بەرد ئەکا بەئاو { هەردوو چاوی دائەخات} ئاه مەرگ بەرەحم ترە.

{بەسمە بەوپەڕی ڕەنگ بزڕکاوییەوەو بەوپەڕی لاوازییەوە دێتە ژوورێ، خۆی بەسەعدیەوە گرتووە، سەعدیە دەست ئەکاتە هەڵهەڵە کێشان، حەسەن خێرا دەمی ئەگرێت}.

حەسەن:دەمت داخە ژنەکە ئابڕوومان مەبە

سەعدیە: ئابڕوو چوون؟ خۆ دزیمان لەکەس نەکردووە، کوڕەکەمان گەڕاوەتەوە ناومان

بەسمە: حامید ئازیزەکەم( بەرەو لای ئەچێت) ئاه خودایا باوەڕ ناکەم بەوەی ئەیبینم حامید قسە بکە ئاه ئەمەچییە؟ بۆچی دەستەکانم لێت هەڵئەگەڕێنەوە.

سەعدیە: وەرە بۆ لای ئامۆژنی خۆت کوڕم

حەسەن: سەعدیە بگەڕێوە( ئەیگرێت) مەسەلەکە خراپتر مەکە.

بەسمە: حامید قسە بکە با گوێم لەدەنگت بێت { هەوڵ ئەدات لەحامید نزیك ببێتەوە}ئاه خودایا من شێت ئەبم، بۆچی ناتوانم ئاوێزانی مێردەکەم بم بۆچی ناتوانم دەست لە مێردەکەمەوە بدەم ئەمە چییە بەسەرم دێت ئادەی یەکێکتان پێم بڵێن، پێش ئەوەی عەقڵم لەدەست بدەم

حامید:ئازیزەکەم بەسمە، هەوڵ مەدە بێ هوودەیە بۆچی ئەشکەنجەی خۆت ئەدەیت

سەعدیە: ئادەی یەکێکتان قسە بکەن ئایا شتێك ئەزانن و نایڵێن و ئەیشارنەوە؟

شەریف: (بەئازارەوە) هیچ شتێ زیاتر لەوە نازانین کە ئەم کورسییانە ئەیزانن

سەلما: ه ه هەمووی بەهۆی هیلاکیی و شەکەتییەوەیە.

حەسەن: (بەگاڵتەجاڕییەکی تاڵەوە) هیلاکیی‌و شەکەتیی

سەلما: هەروەها برسێتیش برسێتی‌و سەرماو تینوێتی ئاه دوو شەو لەچۆڵەوانییدا بێ خواردن و خواردنەوە بێ جێگەو بێ پێخەف بڵێی ئەو ئاسن بێت سەعدیە وەرە وەرە با شتێکی بۆ ئامادەکەین بیخوات{ هەردووکیان ئەچنە دەرەوە}

حامید: {بەئازارەوە} بڵێی بتوانم؟

بەسمە:حامید ئازیزەکەم پێم بڵێ بەژنەکەت بڵێ

حامید: نازانم، بەسمە ئازیزەکەم، نازانم

بەسمە: ئاه من هەڵئەوەرێم

شەریف: کچم ئێمە هەموومان هەڵئەوەرین هەموومان ئەتوێینەوە {ساجید هەوڵ ئەدات قسە بکات، ناتوانێ}.

حامید: ساجید، کوڕەکەم ئەی تۆ چیتە؟

حەسەن: هیچ نەبووە ساجید باشە ئەوەندە هەیە ئەو مەسەلە کت وپڕە زمانی لاڵ کردووە.

حامید: هاوار بەماڵم

حەسەن: حامید، شتەکە کاتییە کاتیی هەروەك دکتۆریش دووپاتی کردەوە، ماوەیەکەو بەسەر ئەچێت لەبەر ئەوە ئاسوودە بە

سەلما: { لەگەڵ سەعدیەدا بەخواردنەوە دێنە ژووری} هەرچییەکت حەز لێیە بۆم ئامادە کردوویت.

حامید: ئاو   قورگم وشەکەو پڕە لەوشکە لم {بەبێ توانابییەوە دەست درێژ ئەکات بۆ پەرداخەکە} ئاه

سەلما: کوڕم ئازار مەچێژە   من خواردنەوەو خواردنت ئەدەمێ

حامید: چۆن چۆنی دایکە! {بەئازارو ئارەزوویەکی زۆرەوە سەیری خواردنەکە ئەکات}

ئەگەر   ئەگەر دڵۆپێك ئاو هەبێت   تەنها دڵۆپێك ئاوو هیچی تر   تەنها پارووێك دایکە

سەلما: کوڕم راکشێ   راکشێ   من ئاوت ئەدەمێ و ئامۆژنیشت خواردن   دەمت بکەرەوە   تۆ تەنها ئەوەندەت لەسەرە دەمت بکەیتەوە   سەعدیە، دەی   { حامد رائەکشێو دەمی ئەکاتەوە   سەلما ئاوی ئەداتێو سەعدیەش خواردن   ئاوو خواردنیش لەملاو لای دەمیەوە رێچکە ئەبەستێ، ئەویش بەشەوقەوە سەر بەلای راست و چەپدا ئەجوولێنێ، ئێ بەڵکو دڵۆپە ئاوێ،کەوچکە چێشتێك بقۆزێتەوە   بەڵام بێ هوودەیە   }

بەسمە: { لەم دیمەنەوە هاڕە ئەکات   خۆی ئەخاتە باوەشی شەریفەوە } باوکە   باوکە رزگارم کە   بریا هەردوو چاوم هەڵ بکۆڵرانایەو ئەم دیمەنەم ئەدیبا   ئای چاوانم چی ئەبینن

{شەریف بەواق وڕماوییەوە دەست بەسەریدا ئەمێنێ}

حەسەن: ئەم حاڵەتە لەسەرووی بەرگە گرتنەوەیە   بەسیەتی ئەشکەنجەی مەدەن ئەرێ ئێوە بەردن؟

شەریف: حامید هەستە   هەستە   تۆ بۆچی گوێ لەم دوو شێتە ئەگریت، لەکاتێکا ئەزانیت چ سوودێك نابینیت

حامید: من   من   برسیو تینوم برسێتی هەناوم ئەخوات   تینوێتی لەمۆخی ئاو ئێسقانم ئەخواتەوە

شەریف: من ئەزانم برسێتی کافرە   کافر تینوێتیش بوونەوەرێکی خورافیەو لەبرسێتی دڵرەقترە   بەڵام ئەی   ئەی

بەسمە: ئا   ئەبرسێتیو ئەتینوێتی وا لە مرۆڤ ناکەن بەم شێوەیەبرستی لێ ببڕێت   بەڵام ئومێد   ئومێدی ئەو رزگار بوونە لەو حاڵەتەی تیایدایە

حەسەن: ئاخر هیچ ئومێدێك نییە

سەلما: ئاه   حەسەن   چ دڕندەیەك لەناختایە

حەسەن: لەناخی مندا یان لەناخی تۆدا کوڕەکەت سەر ئەبڕیت و چێژ لەلنگە فرتێی وەرئەگریت وەك چۆن منداڵێك وا لە چۆلەکەکەی ئەکات

{لەدەرەوە دەنگە دەنگ دێت و هەروەها لەدەرگادانی خێراو بەزەبر ئەبیسترێت}

دەنگێ: {لەدەرەوە} مویارەك   ئادەی مویارەك   وەرە دەرەوە بۆمان.



بەسمە: {ساجید لەئامێز ئەگرێ کەبەرەو لای ئەم را ئەکات} مەترسە   . رۆڵە گیان مەترسە

حەسەن: ئەوە دەنگی حاجی سەلیمە

شەریف: وایە   ئەوە دەنگی ئەوەو باشە چی وای لێ کردووە ئاوا هەڵگەرێتەوە؟ پاشان   مویارەك کێیە وا بانگی ئەکات

سەلما: کوڕەکەتە   لەو زیاتر کێیە {بەرەو دەرگاکە ئەچێت   بەتووندی ئەیگرێ}

شەریف: نا   ئەمجارە نا   ئەگەر هەر بیرۆکەیەك لەو بیرۆکانەی کەشێتانە مێشکتیان پڕ کردووە، جێ بەجێ بکەیت، وەڵڵاهی ئەتکوژم

حاجی: { لەدەرەوە دەنگی دێ} مویارەك، پۆزشم قبوڵ بکەو، لای خوا داوای لێبوردنم بۆ بکە کە من بەخراپیی لەتۆ گەیشتبووم تۆ هەمیشە نموونەی بەخشندەیی بوویت و نزات بۆ کردووم   بەبێ نزاکانی تۆ من لەناو چووم   مویارەك   من فەرتاوم

دەنگێ: ئادەی با بچینە ژوورەوە بۆ زیارەتی   خۆ ئەو نە سەروەتەو ئەئاڵتوون تاکو هەر بۆ خۆتان بێت بەتەنها   ئەوە بەرەکەتێکە خوا لەئاسمانەوە بۆ هەموومانی ناردووە

شەریف: ئەوەشیان دەنگی سەعدونە ئەویش شێت بووە

دەنگێ: چەند ساڵە دایکم شەلەل ئێی داوە   بەکەس چاك نابێتەوە، پەو ئەبێ.

دەنگێ: ئەرێ ئەم دڵڕەقانە بۆچی دەرگا ناکەنەوە.

دەنگێکیتر: ئەم بازرگانە چاو برسییانە، بۆ هەر شتێك نرخێکیان ئەوێت.

دەنگێ: هەر چیم هەیە ئەیدەم   خەڵکینە، دایکم لەخەونیدا تارماییەك بەراشکاویی پێی ووتووە: حامید   حامید ئا   ئەوان بۆیان نییە بیشارنەوە   وەرن با دەرگاکە بشکێنین

بەسمە: هاوار بەماڵم   دەرگاکە ئەشکێنن   ئادەی شتێ بکەن   { دەرگاکە بەسوورگی دا ئەخات و حەسەن و شەریفیش کورسیو قەنەفەکانی ئەخەنە پاڵ}

دەنگێ: پەنجەرەکە   وەرن لەپەنجەرەکەوە بچینە ژوورەوە

حاجی: خەڵکینە لەسەرخۆبن   رۆح ئەوەندە لەماڵاندا نامێنێتەوە، بەڵکو بێتە دەرەوە

دەنگێ: ئادەی بەرزم بکەنەوە لای پەنجەرەکە   لێ گەڕێن با ببینم

دەنگێکیتر: ببینیت؟چیی ببینیت لەکاتێکا تۆ کوێریت.

دەنگ: خەڵکینە ئادەی بەرزی کەنەوە بەڵکو خوا لەسەر دەستی حامیدا شیفای بۆ نووسیبێ.

{شووشەی پەنجەرەکە هاڕە ئەکات }

سەعدیە: چی بکەین   شوشەی پەنجەرەکەیان شکاند



حامید: بمشارنەوە     مەهێڵن کەس بم بینێ{ بازنەیەکی بەدەورا ئەکێشن}

دەنگ: ها    ئەیبینیت؟

دەنگەکەیتر: (ئەوەی بەرزیان کردۆتەوە) بەڵێ   بەڵێ   بوونەوەرێکی نورانییەو خەریکی نوێژ کردنە.

شەریف: نوێژ ئەکات؟ هەمووان سەیری حامیدی گرموڵە بوو ئەکەن}.

حاجی: { لەدەرەوە} نوێژەکەی پێ مەبڕن لێی گەڕێن{ دوای دێینەوە لای ئەمان لەو کاتەدا گوێ لەدەنگی ئەوان ئەگرن کە چۆن دوور ئەکەونەوە}.

هەمووان: کوێرەکە وتی نوێژ ئەکات{ بەسەرسوورمانەوە سەیری یەکتری ئەکەن}

سەلما: بەڵێ نوێژ ئەکات   چیتانە. سەرتان سوڕ ئەمێنێ   کوێرەکە راستی کرد   ئەو

شەریف: گوێ بگرە ژنەکە   من ئاگادارم کردیتەوە لەوەی

سەلما: ئاگادارت کردمەوەو منیش گوێڕایەڵیم کردیت   ئەوەتانێ ئەوانیش رۆیشتن   { کورسییەکان لا ئەبات و هەردوو تاکی دەرگاکە ئەخاتە سەرپشت} ئەوەتا کەسی لێ نییە. ئەو ئەبێت هیچ نەماوەتەوە، هەروەها ئەو نهێنییەشی کە بۆیان ئاشکرا کردین

هەمووان: نهێنی؟

سەلما: بەڵی   نهێنی   ئەوە چیتانە وا هەڵئەلەرزن   من هەڵوێستەم لەئاست نهێنییەکەدا کردووە   { {بەسوجدەوە روو ئەکاتە حامید} ئەو موبارەکەو ئێمە پیسین   ئەو رۆحییەو ئێمە بەشەر   ئەو نوورانییەو ئێمە تاریکی پەرست

شەریف: ئەرێ ئەوە تۆ خلەفاویت هەی

سەلما: لەبەر ئەوە: کەسمان ناتوانێت دەستی لێوە بدات و جورئەتی نییە لێی نزیك ببێتەوە تەنها تاکو ئەو سنوورە نەبێت کە خواوەند ئەیەوێ

شەریف: ئەی ئاوو خواردنەکە   بلێی ئەوانیش پیس بن وا ئاچنە ناو دەمیەوەو بەملاولای دەمیدا دێنە خوارێ   ئاخی ئەبزوێنن و کەچی لەلێوەکانی نزیك نابنەوە

سەلما: ئاو ئاوی ئێمەیەو خواردنیش هەر هی ئێمە   ئەویش   ئەویش بوونەوەرێکی ترە

شەریف: ئەم ژنە شێت بووە   زیاتر لەو ژن و پیاوانەی کەخلەفاون و خەریك بوو ماڵەکەمان بەسەردا بروخێنن

سەلما: بەڵام خۆ وایان ئەکرد   بۆچی؟ ئەی پرسیارت لەخۆت ئەکردووە بۆچی؟ بلێی لەئێمە ترسابن؟ ئەی ئێمەیان ئەکردە مشکی ناو تەڵە (بێ دەنگی) وەڵام بدەرەوە بۆ بێدەنگ بوویت   وەڵامم بدەنەوە بۆ بێ دەنگ بوون (بێ دەنگی) چونکە مەشیئەتی خوا وای ویست

حامید: دایکە   دایکە   هێندە زیادە رۆیی لە وەهم و خەیاڵە خورافیەکانتدا مەکە   هەرچی منیشم

سەلما: تۆ مەخلوقێکی پیرۆزیت کوڕم   تۆ

حامید: نا بەڵکو من مەلعونم   مەخلوقێکی مەلعونم   مەلعونم دایکە

هەمووان: حامید

حامید: ئەوە حەقیقەتە: ئیتر کاتی ئەوە هاتووە بیزانن

حەسەن: ئاخر لەبەردەم ژنەکاندا نا   ئەی

حامید: بەڵکو لەبەردەمی هەموویاندا و لەبەردەمی ئێوەشدا   تەنانەت ئەم بوونەوەرە شەفافەش کە لەپاکیی و منداڵێتییەکی بێگەرد خولقاوە، پێویستە ئەویش بیزانێت کەباوکی مەلعونەو، هەروەها مەحکومە بەسزایەك کەلەعەقڵدا نییە   تکاتان لێ دەکەم یارمەتیم بدەن   رزگارم بکەن   تەمەنی ئەم ئەشکەنجەیەم کورت بکەنەوە

سەعدیە: باشە کوڕم، بۆچی سزا؟

حامید: چونکە من قەرزارم   تاکو ئێستاش گەلێ قەرزم لەئەستۆدایە   یان تاکە قەرزێکی ترسناك کەنازانم چییەو ؟ بەچەندە؟ کێ خاوەن قەرزەکەیە؟

بەسمە: ساڵانێکە تۆ مامەڵە بەقەرزەوە ناکەیتو، هەرچی قەرزە کۆنەکانیشتە، دەمێکە داومانەتەوە.

حامید: ئاخر ئەوەیە مەسەلەکە، ئەوەیە دەماغی من ئەهەژێنێ   من دەمێکە لەمامەڵەمدا لەگەڵ خەڵکیدا ئاخیرەتم بەلاوە ناوە

سەلما: نا   کەس قەرزێکی لەئەستۆی تۆدا نییە   هیچ قەرزێك

سەعدیە: سەلما، پەلەمەکەو بە نا وەڵام مەدەرەوە   با دەفتەرو کاغەزە کۆنەکانی بگەڕێین رەنگە کەسێکیتان لەبیرکردبێت.

شەریف: ئەی کاغەزە کۆنەکانی لەکوێن؟ هەموویان بوونە خۆراکی ئاگرو بونە خۆڵەمێش

حەسەن: لەو خەڵکە ئەپرسین کەمامەڵەی لەگەڵ ئەکردن

شەریف: ئەی لەکوێ ئەو خەڵکە بدۆزینەوە   زەمەنێکی درێژ بەسەر چووە ئەوەی مردووە مردووەو، ئەوەشی

حامید: ئەی چارە چییە باوکە؟ خۆ ناکرێ لەژێر باری ئەم سزا سەیرەدا وازم لێ بهێنن   ئەو پێی ووتم   بەوپەڕی راشکاوییەوە پێی وتم من کەسێك ناگرمە خۆم کە قەرزێك لەئەستۆیدا بێت

بەسمە: پێی وتیت؟ کێ پێی وتیت؟

حامید: زەمین.

هەمووان: { بەسەرسوورمانێکی زۆرەوە} زەمین؟ {لەنێو خۆیاندا ورتە ورتێك ئەکەن}

حامید: بەڵێ زەمین

شەریف: زەمین تۆی دواند، قسەی لەگەڵ کردیت؟

حامید: ئەی باوەڕم پێ ناکەن؟ (بێ دەنگییەك)ئێوە باوەڕ بەمن ناکەن   لەچاوتاندا گومان ئەخوێنمەوە.

بەسمە: بەڵام زەمین   ئاخر، حامید   زەمین؟

حامید: ئاە   چ نائومێدییەکە، کەس باوەڕم پێ ناکات   ئەمە زۆر خراپترە لەوەی کە ئەیچێژم   قورسترە لەو عەزابەی کە ئەیچێژم کەواتە مانەوەم لەلاتان چ سوودێکی هەیە کە هیچ کەسێکتان هاوکاریم ناکات

{ چۆن هاتە ژوورەوە، ئاواش بەئیمچە فڕینێکەوە ئەچێتەوە دەرێ}

هەمووان: { بەدوایدا رائەکەن} بگەڕێوە حامید   حامید   بگەڕێوە   ئاە حامید

## دیمەنی دووەم

حامید: { بەهیلاکییەکی زۆرەوەدێتەوە ناو گۆڕستان} سوپاس بۆ خوا کە دوای سێ رۆژ گەڕان، لەدۆزینەوەی خاوەن قەرزەکەدا سەرکەوتنی پێ بەخشیم { بەرەو گۆڕەکەی هەنگاو ئەنێت} بەڵام ئەی خەڵك بۆ وایان لێهاتووە درۆو دوو زمانیی بەدەم یەکترەوە ئەکەن.

لە هەر کەسێك نزیك ئەبمەوە هێندە نابا دڵە لەرزێی پێ ئەکەوێ   نا   داوای هیچت لێ ناکەم، تۆ قەرزاری من نیت، من قەرزاری تۆم   ئاە لەخەڵك   ئاە   (ئەچێتە گۆڕەکەوە) ئێستا وەختێتی حامید، ئەی ئەشکەنجە چێژ، ئێستا وەختت هاتووە کە لەئارامگەکەتدا راکشێی بەئارامییەوە چاو لێك بنێی   من قەرزەکەی خۆم کە قەرزێکی بچووك بوو دامەوە   ئەئەبوو ئەم سزا نابەجێیەم بەسەردا بسەپێنێت   ئەو قەرزە هێندەی ئەئەهێنا

دەنگێ: { دەنگێکی نامۆیە   وەك ئەوە وایە لەهەر چوار لای گۆڕستانەکەوە بێت} قەرزی من ئەپارەیە، ئەناڵتوون

حامید: { بەراچڵەکینەوە} ئەی ئەو قەرزەی تۆ ئەکرێ چی بێت( بێ دەنگی)   وەڵامم بدەرەوە قەرزەکەی تۆ چییە   چییە؟

شاکر: { لەو سەری گۆڕستانەکەوە دێت} ئەی نازانیت؟ ئەی ئەتزانیوە؟

حامید: شاکر پێم بڵێ چییە   شاکر بیڵێ

شاکر: بەراستی من نازانم چییە

دەنگ: تۆ وەك جەستەیەکی سەر ئاو کەوتوو ئەمێنیتەوە   ئەزەوی ئەتگرێتە خۆی و، ئەئاسمانیش قەبوڵت ئەکات   تاکو بزانیت ئەو قەرزە چییەو بیدەیتەوە.

حامید: (هاوار ئەکات)   ئەمە عەدالەت نییە   ئەمە عەدالەت نییە شاکر   فریام کەوە شاکر

شاکر: { بەرد بارانی ئەکات} برۆ   برۆ   دەی   برۆ   { حامید ، ئەگەر چی بەردەکانیش بەری ناکەون، بەڵام لەتاو ئازار هەر گینگڵ ئەدات}.

سەرچاوە:-

گۆڤاری الاقلام   ژمارە دوو-شوباتی 1990

ل ل 74-87

# "زێوان"

**نووسینی: محێدین زەنگنە**
**رۆڤار کردوویە بە کوردی**

### کەسێتییەکان

**مەسعود:** گۆڕهەڵکەنێکە بە تەمەن نزیکی حەفتا سالانە
خەلیل: زێوانی گۆڕستانە هاوتەمەنی مەسعودە
مەحمود: گەنجێکی لە خوار بیست سالانەوە

ئامارژەیەك: "ئەم شانۆییە پشتی بە رووداوێك بەستووە کە لە پەنجاکاندا و لە گۆڕستانی (شێخ محێدین)ی شاری کەرکوك رویداوە، واتە ملکەچی بارودۆخێکە، کە رووداوە راستەقینەکانیش ملکەچین کاتێك کە هونەر لێکی هەڵدەشێلێ و سەرلەنوێ دایدەڕێژێتەوە"

[گۆڕستان. گەرمایەکی بە تینی خۆری پێش نیوەڕۆ. چەند قەبرێکی هەڵکەنراوی سەرداپۆشراو، گۆڕێکی تریش کاری تێدا دەکرێ. گۆڕهەڵکەنێکی پشت چەماوەی شەکەت بە تەمەن نزیك حەفتا سالەی لێ دێتە دەرێ و بۆ لای مەرکانەی ئاوی ژێر حەسیرەکە دەچێ. ئاو دەخواتەوە، دەم و چاوی دەشوا، جگەرەیەك دادەگیرسێنێ، دەکۆکێ. دەگەڕێتەوە ناو گۆڕەکە و خەریکی سەرداپۆشینی دەبێت. زێوانی گۆڕستانەکە بەدیار دەکەوێ، لە حالی گۆڕهەڵکەندنایە، بە قەبرە تازە داپۆشراوەکاندا دەڕوانێ].

**زێوان:** ها مەسعود.. ئێستاش هەر خەریکی هەڵکەندن و سەرداپۆشینی قەبری؟!
**مەسعود:** بۆ ئەمە خراپەی بۆ کەس تیایە؟ ئایا هەقی گۆڕهەڵکەندنەکەم نەکریوە؟ ئایا کرێت نادەمێ.
**زێوان:** بە من؟ بۆ من خاوەنی گۆڕستانەکەم (مەسعود دەکۆکێ)- کۆکینەکەی توندتر دەبێ.
**مەسعود:** گلەییم لە تۆ نەکردووە.
**زێوان:** تۆ هەر وەك خۆتی، هەمیشە میزاجت خراپە (نەچێ بۆ لای ئاوەکە)
**مەسعود:** وەرە تۆش وەکو من لە بەرەبەیانییەوە تا ئێوارە خەریکی هەڵکەندن بە، ئەوسا هەول بە میزاجت لە هی من باشتر بێت!
**زێوان:** بە زەییم پیاتا دێتەوە کە ئەو هەموو ڕەنجە بێسوودە ئەدەی.
**مەسعود:** بۆچی بێ سوودە، خوا ڕزقی بەندەی خۆی ئەدا. بەلام ئەوەیە جارێ ئەیگرێ و جارێ ئەیکاتەوە.
**زێوان:** ئامەنتو بیلا! [ئاوەکەی دەخواتەوە.. هەولدەدا میهرەبانی خۆیی بۆ بنوێنێ] ئازانم بەم گەرما بە تینە چۆن دەتوانی ئەو ئاوە بە ساردی رابگری.
**مەسعود:** "گوێ بە تێبینییەکەی نادات" ئەگەر ڕزق و ڕۆزی هەمیشە سەردانی مرۆڤی نەکرد ئەوا دەبێ لانی کەم خۆمان لە پێشوازیدا بین تا دێت (لێی وورد دەبێتەوە)
**زێوان:** ئە.. ئاوا پێشوازی بکەین، بەو قەبرانەی لێرەو لەوێ پەرش و بلاویان دەکەیتەوە؟
**مەسعود:** لێرەو لەوێ پەرش و بلاویان ئەکەمەوە؟! ئەمانە قەبرن خەلیل: گول نین گۆڕستانەکەیان پێ برازێنمەوە.
**زێوان:** (بە ڕەقی) گۆڕستان گۆڕستانی ـ من نییە!
**مەسعود:** پێم بلێ خەلیل، تۆ لە قەبر ئەترسی؟
**زێوان:** کابرا تەمەن بە دەست خوایە.
**مەسعود:** (لێی ورد دەبێتەوە) ڕزق و ڕۆزیش هەر لەلای خواوەیە (دەکۆکێ).
**زێوان:** تۆ ئەگەر چارەیەکی ئەو کۆکینەت نەکەی وێران دەبی (ئینجا) بۆ ئاوا بەو شێوە غەریبە لێم ورد دەبیتەوە؟ ئاشێ بە خۆراکی یەکێ لە چالە دەمداپچڕاوەکانتم بزانی؟!





**مەسعود:** ئەترسم ئاژەڵێکی ڕێ هەڵە کردووی "پێش ئەجەلی خۆی تێ بکەوێ و لای خوا گوناهبار ببم (بە دەم سەرداپۆشینی گۆڕەکەوە) بۆچی هاتووی؟

**زێوان:** تینووم بوو ئاوەکەی لای منیش هاتۆتە کوڵ، هاتم لە ئاوە ساردەکەی لای تۆ بخۆمەوەو ئیتر..

**مەسعود:** ئیتر چی؟

**زێوان:**(بە خەمێکەوە) مام مەسعود تەنیایی زۆر سەختە (ئەیەوێ دابنیشێ) منیش لەوێ...

**مەسعود:** (قسەکەی پێ دەبڕێ) تۆ دەربارەی چی ئەدوێی، من لێرە ئیش دەکەم (بە توڕەییەوە گڵەکە توڕهەڵئەدا) باشتر وایە بەجێم بێڵی.

**زێوان:** (بە حەسرەتێکەوە) جگەرەیەکت پێ نیە، من هیچ جگەرەم لا نەماوە.

**مەسعود:** ئەوە قتووەکەیە لە لاتەوە، چەندت ئەوێ ببە.

**زێوان:** جگەرەیەکم بەسە، بەڵام ئەگەر ئەو کوڕە، مەحمود هات بەڵکو بۆم بنێرێ.

**مەسعود:** باوەڕ ناکەم بێت، پاشان ئەو کوڕ نیە پیاوە (دەکۆکێ) چیت لێی ئەوێ؟

**زێوان:** جگەرەم بۆ بکڕێ

**مەسعود:** مەحمود خزمەتکار نیە. ئەوە قتووەکەت بە دەستەوەیە. ببە بۆ خۆت (دوای پڕکردنەوە چاڵەکە ڕێك دەخا).

**زێوان:** (قتووەکە فڕێ ئەدا) تەنانەت خوڵقیشت وەکو خۆت بێ تامە.

**مەسعود:** (لە پشتەوە بۆی دەڕوانێ، بە باڵایدا دەڕوانێ. بە پەلە دەگەڕێتەوە، دەکەوێتە هەڵکەندنی چاڵێکی تر،) بەخت.. هەموو جارێ لە دەرگا نادا. بەڵام کە لە دەرگای دای پێویستە کەسێك هەبێ بچێت بە دەنگەوەو پێشوازی لێ بکا (لەسەر هەڵکەندن بەردەوامە شانۆ بۆ ماوەیەك تاریك دەبێ و پاش ڕوناك بوونەوە ئەو کارەکەی تەواو کردووە، لە چاڵەکە دێتە دەرەوە ئەچێتە بەر سێبەری کەپرە حەسیرەکە، نان دەخوا، ڕادەکشێ جگەرەیەك دەکێشێ. کۆکە لێی ناگەڕێ، هەڵدەسێ. بۆ ئەملاو ئەولای دەڕوانێ) ئای.. ئای، گەنجە قوڕمساغەکانی ئەم دەورو زەمانە، تف، سەعاتێ خەو بەکرێی ئیشی ڕۆژێك دەگۆڕنەوە (دادەنیشێ بە دەنگێکی ژنانە لاسایی دەکاتەوە) نازانم بۆ ئەم مەحمودە بە درێژایی ئەمشەو هەر ئەمدیواو دیوی دەکرد و نەدەخەوت. ئێستا ئەبێ بێدەنگ و کپ بوو. نا.. نە بەخوا، نامەوێ خەبەری بکەمەوە (ئەمجارەیان بە دەنگی خۆی) ئەی ئێستا بۆ خەبەرت کردەوە، بۆ ئەتهێشت ئەو کوڕە نازدارەت شەوو ڕۆژ بە یەکەوە گرێ بدا؟ بە تاکی تەنیا خۆم سێ گۆڕم هەڵکەندووە، پشتم ترازا.. نەخێر یەك فلسی نادەمێ (گەنجێکی لاواز دێتە ژورەوە نیشانەی نەخۆشیەکی پێوە دیارە) ڕوناکت کردینەوە؟ خۆ هێشتا خۆر ئاوا نەبووە، دەبوو هەر لە خەودا بیت تا هەر بە تەنیا وەك گۆڕهەڵکەنینەکە مردووەکانیشم بنێژایە.. ئەوجا کرێ کەت دەهێناو لە ژێر سەرینەکەت دادەنا.

**مەحمود:** (بە جۆرە شەرمێکەوە)، مام مەسعود ئەنوستبوم.

**مەسعود:** ئەی دایکت درۆی لەگەڵ کردم؟

**مەحمود:** دایکم.. درۆ ناکا.

**مەسعود:** (لاسایی دەکاتەوە) دایکم درۆ ناکا.. کەوابوو من درۆ ئەکەم.

**مەحمود:** دوو لە تۆ مام مەسعود، لە ناو جێدا بووم، بەڵام نەخەوتبووم. (دەکۆکێ)

**مەسعود:** باشە لە ناو جێدا چیت ئەکرد، منیش لێرە تەپووتۆز بم خنکێنێ لەبەر خۆرەکەدا بسوتێم؟

**مەحمود:** لە..

**مەسعود:** کارم بە سەرەوە نیە لەکوێ بویت یا نا.. دە بچۆرەوە بۆ ئەو جێیەی لێی بووی. (زۆر بە توندی دەکۆکێ)

**مەحمود:** (بە ترسەوە) مام مەسعود.. شوکور سەلامەتی.

**مەسعود:** ئەی بۆ نا.. تۆ لێرە بی یا نا من هەمیشە سەلامەتم.

**مەحمود:** مام مەسعود.. من..

**مەسعود:**ئیمڕۆ تۆ ڕۆژانەت نیە.

**مەحمود:** لەبەر ئەوە نەهاتوم.

**مەسعود:** ئەی باشە بەم نیوەڕۆیە بۆ هاتووی، هەر بۆ ئەوەی لە ناشتندا یاریدەم بدەی؟

**مەحمود:** (بە دەوری خۆیدا دەڕوانێ) نا.. ناش.. تن؟ (پاشان) خۆت چۆنی بە باش دەزانی.

مەسعود: نا.. نا.. ئاشتن لە گۆڕهەڵکەندنەکە ئاسانترە، وەك دەزانی لە ئاشتندا هەمیشە خەڵکانێك لەگەڵ مردودان. ئەوان بێ هیچ بەرامبەرێك یاریدەم ئەدەن.

مەحمود: داوای لێبوردن دەکەم.. من.. من زۆر بە داخەوەم.

مەسعود: جا باشە لێبوردن چ سوودێك بە من دەگەیەنێ، لە کاتێکدا ئەم ماندوبوونە بڕستی لێ بڕیوم و گۆڕستان هێزی پێ نەهێشتوم.

مەحمود: ئەوە پەروەردگار پشتیوانتان بووە.. وە..

مەسعود: ئەو مۆڵەتی لە تۆ ناوێ.. (دەکۆکێ، کۆکە بڕستی دەبڕێ).

مەحمود: (بەزەیی بە حاڵیا دێتەوە) نا..

مەسعود: گوێ بگرە مەحمود، بێ منجە منج و نووزە نوور، خۆی ڕاستە باوکت پیاوێکی باشەو هاوڕێی عومرە، هەر ئەویش تکای لێ کردم لای من کار بکەی.. بەڵام من ناتوانم شتێکت بدەمێ بەرامبەر بە هیچ.

مەحمود: ڕاستە.. مامە.. ڕاستە.

مەسعود: پاشان باوکیشت قایل نابێ بەرامبەر نیوەرۆژخەو من ڕۆژانەت بدەمێ. ئینجا من لە سەر گەنجینە دانەنیشتووم.. ئەوەی دێتە دەستم بەشی خۆم ناکا.

مەحمود: هەقی خۆتە مامە.. هەقی خۆتە..

مەسعود: جا ئەوەی تۆ لێمی وەرنەگری.. من بۆ خۆم پێویستم پێیەتی.

مەحمود: ئەمە دەزانم. لەمڕۆ بەدواوە هیچت لێ وەرناگرم.

مەسعود: بۆ خۆبەخشانە ئیش دەکەی؟ نا.. نا. مەحمود من پیاوێکم ڕێزی خۆم لە لایە خێرو منەتی کەس قبوڵ ناکەم.

مەحمود: من.. من ئیش ناکەم.. نامەوێ کە..

مەسعود: ئەی بە چی دەژیت؟ بە خۆڵ؟ پاشان.. پاشان تۆ بیرت لەو دایکە پیرەو باوکە پەککەوتەیەت کردۆتەوە؟

مەحمود: ئیش ئەکەم.. مەبەستم.. مەبەستم ئەوەیە بەدوای کارێکدا ئەگەڕێم.

مەسعود: ڕاوەستە، ڕاوەستە، یانی چی ئیش ناکەی.. نا.. نا.. مەبەستت ئەوەیە لەگەڵ مندا کار ناکەی؟

مەحمود:ئـ.. ئـ.. ئـ مامە گیان خۆشم ئەوێ "مەسعود ئازاری هەیە.. سنگی دەشێلێ" مامە.. ئەوە چیتە؟

مەسعود: چاوەڕوانی ئەوەم ئەدەکرد. وەرە.. وەرە دانیشە.. هیچ ئەزیەتم دای؟

مەحمود: نەخێر من لەوپەڕی باشیدام.

مەسعود: کەوابو، ئیتر چیە؟ گرانە؟ یانی ئیشەکە بەو جۆرە گرانە؟

مەحمود: کارەکەم ئەزیەتم ئەدا. من بەرگەی ئەو ئەزیەتە ناگرم.

مەسعود: ئەزیەت.. ها.. ئەزیەت؟ هیچ حەوانەوەیەك نیە بە بێ ئەزیەت.. پاشان تۆ باس لە چ ئەزیەتێك دەکەی ئەرکی گەورە بە سەر منەوەیە من گۆڕ هەڵدەکەنم و گڵ فڕێ ئەدەم.. منم کە..

مەحمود: ئەوە بەلای منەوە گرنگ نیە، بەڵکو..

مەسعود: کرێ؟ کرێکەت کەمە؟ وا نیە؟ جا گوناهی من چیە، خۆ ملیۆنێکم دەست ناکەوێ، پاشان خەڵکەکە چاوچنۆکن بە تەنگ مردووەکانیانەوە نایەن.

ئینجا مردووەکان، مردووەکان خۆشیان کەم. پەنام بە خوا.. کوڕە خەریکە زەللەم پێ دەکەی.

مەحمود: مام مەسعود.. من..

مەسعود: تۆ بەرژەوەندی خۆت نازانی. ئەو سەگە پیرە خەڵەتاندووتی، دوێنێ بینیمت لە گەڵیا ئینکاری مەکە، من دەزانم بە ڕۆژانەی زیاتر تەفرەی داوی، وا نیە؟

مەحمود: کێ؟ مەبەستت لە کێیە؟

مەسعود: هادی و خەڵکی وەك هادی، با بزانیت قەبرسانەکەی ئەو هەمووی بەردەڵانە تەنانەت نوێڵ و پیك بەرگەی ناگرن و ئاسنیشی تیا ئەپروکێ بەڵام هەر بەخۆشی نازانێ.. ناڵەبار ترین زەوی ئەم دنیایەیە

مەحمود: بەڵام مام هادي هیچ پەیوەندیەکی بەو بۆچوونەی تۆوە نیە.. یا..

مەسعود: بەڵی خۆیەتی، ئەو سەگە مڵەیە.. هەر دەبێ بە دەستی خۆم بینێـژم ئا ئەوە.. ئا ئەوە گۆڕەکەیەتی بە پشتیوانی خوا بە تەرمەکەی ئەو ئەبێ پڕی ناکەمەوە. ئەبینی.. ئەبینی.. (ئەچێ بەلای گۆڕێکەوە و ئەو قوماشە لادەبا کە گڵەبان کراوە. کۆکە دەیگرێ).

مەحمود: (بە ترس و دڵەڕاوکێوە) مامە.. مامە.. حاڵت خراپە.. زۆر خراپە. (مەسعود وەك هەر گوێی لێ نەبێ لە سەر کارەکەی بەردەوامە).

مەسعود: ئەو ئەگریسە هەموو وەرزێك ململانێم لەگەڵ دەکا کار گەیشتۆتە ئەوەی سێ قاتی ئەوە بدەم کە پێشتر داومە.

مەحمود: مامە باوەڕم پێ بکە.. هادی

مەسعود: هادی و ئەوانی وەك ئەون-سەگی برسین، بۆ پلەگۆشتێك پەلاماری دایکشیان ئەدەن، بەڵام تۆ هەرگیز لای ئەوان زەویەکی وەکو ئەم خاکی گۆڕستانەی لای منت دەست ناکەوێ هەر ئەتوانی بە ئینۆك هەڵیکۆڵی بڕوانە.. بڕوانە.. لە کوێ ئەم نیعمەتەت دەست ئەکەوێ "دەست ئەکا بە هەڵکۆڵین".

مەحمود: مامە، هەمو پەنجەکانت بوونە خوێن، تکا ئەکەم بەسە بەس (دەستی ئەگرێ) من ئیازم نیە لای هیچتان ئیش بکەم. من هەر لە ئیازما نیە کاری گۆڕهەڵکەنی بکەم.

مەحمود: ئاوا؟ دیارە بەنیازیت بازرگانی بکەیت، دەی خوا پشتیوانت بێ (بە لاقرتێوە) ئەگەر پێ گەیشتیت و بوویتە بازرگانێکی گەورە، مامە مەسعودی ڕسوای ناو گۆڕستانت یاد نەچێ.

مەحمود: من؟ ئا مامە گیان، هەتا لە ژیاندا بم چاکەی تۆ لە یاد ناکەم.

مەسعود: تۆ زۆر سەیری، لەگەڵ ئەوەی کە زۆر پێویستیت بە منە کەچی بەجێم دێڵی. مەحمود، (مەحمود بێ تاقەت دیارە) ئەوەی لە دڵتایە بیڵێ، قسە لە ڕوو بە کوڕی خۆم.

مەحمود: خۆزگە ئەمتوانی (بێ تاقەتە) خۆزگە ئەمتوانی..

مەسعود: هیچت لێ بینیوم؟ ناڕێکیەك لە ئیشەکەمدا هەیە؟ بۆ نموونە، گزی لە مردووەکان دەکەم؟

مەحمود: خوا نەکا، نەء، تۆ نموونەی پیاوچاکی و سەر ڕاستیت

مەسعود: گوێ بگرە کوڕم، من لە جێی باوکتم، ئەو تۆی بە ئەمانەت لای من داناوە تەنانەت.. تەنانەت بیرم لەوە کردبۆوە ئەو ئەرکە گرانەی بە سەرمەوەیە بیخەمە ئەستۆی تۆ، تۆ جێی متمانەی منی، ئەوەی بە مێشکتا دێ بیڵێ و قسە لە ڕوویە.

مەحمود: بم بورە، مامە.. لەمڕۆ بە دواوە متمانەم مەدەرێ.

مەسعود: متمانەت ئەدەمێ؟ (ئەکۆکێ) کوڕە ئەوە ئەڵێی چی، من متمانەی بەرو دوام لە سەر خواو ڕەنجی خۆمە، مادام توانای پاچ وەشاندم تیا ماوە، زیندەوەرێك نیە پشتی پێ ببەستم.

مەحمود: ئەزانم، ئەزانم چەند بزورگ و بە توانای، ئاواتمە بە درێژایی تەمەنی خۆم خزمەتت بکەم، بەڵام..

مەسعود: بەڵام چی؟ قسە بکە بەڵام چی مەحمود (زۆر بە توندی ئەکۆکێ) قسە بکە با ئەخنکێم..

مەحمود: ئیش، ئیشەکە خۆی زۆر ئازاربەخشە بۆ من، تووشی نائومێدیم ئەکاو خەوم لێ ئەزڕێنێ نە شەو نە ڕۆژ خەو ناچێتە چاوم (مەسعود زۆر دڕندانە لێی دەڕوانێ" ئـ..ئـ.. لە من توڕەیت؟

مەسعود: ها؟ نا.. نا.. بەڵام من سەیرم لەوە دێ، سەرەتای هاتنە سەر کارت چۆن بوو ئێستاش چی دەڵێی، سەیرە دوای چەند ساڵ کارکردنت دێیت و وا دەڵێی و وا دەڵێی، بە ڕاستی پێم سەیرە، من وام زەین دەکرد زۆر گونجاو بیت لە گەڵما.. تەنانەت.. تەنانەت، ئاسودەش بیت.





**مەحمود:** بەڵێ وایە، وەکو دەڵێی زۆر گونجا وو ئاسودە بووم، بگرە دایك و باوکم وەك پاڵەوان و فریاد رەس هەموو ئێوارانێك پێشوازیان لێ ئەکردم، ئەوەش هانی ئەدام پێش کازیوە منیش تۆ ئاسا بگەمە گۆڕستان و بە درێژایی ڕۆژ بێ ماندوێتی و بێزار بوون خەریکی ئەو کارە گرانە بم.

**مەسعود:** ئەی کەوابو، چۆن وا گۆڕایت؟ (ئەکۆکێ)

**مەحمود:** بە تەواوی نازانم، یا.. یا.. ناتوانم روونی بکەمەوە، نا..

**مەسعود:** باشە.. باشە.. ئەوەکەی ڕویدا؟ مەبەستم لەوەیە لە کەیەوە هەستت بە دڵتەنگی و بێزاری کرد، لە من؟

**مەحمود:** (خەریکە دەگری) مامە لە تۆ نا، هەرگیز لە تۆ نا..

**مەسعود:** باشە.. باشە.. ئەی لە گۆڕستان.. ئەی لە ئیش؟ (مەحمود ئازار دەچێژێ) ئەو ڕۆژەی چوویتە ناو قەبرەکەوە؟ (وەڵام ناداتەوە) وا نیە؟ (بێدەنگی) پێویست بوو خۆم بەوە بزانم کە بۆ منالێکی وەکو تۆ سانا نیە دەست لە مردوو بدا (ئەکۆکێ) لەوە زیاتریش چارەم نەبوو ئازاری پشتم بڕستی لێ بڕیبووم کەسێکی خاوەن مردوەکەش ئەنئەمات هاوکاریم بکات هەریەکەیان خەریکی فرمێسکە درژینەی خۆی بوو.. پاشان ئەگەر ڕۆژێ لە ڕۆژان ویستت جێی من بگریتەوە پێویستە فێربی، هەرگیز فێریش نابی ئەگەر دان بە خۆداگرو ڕەق نەبیت.

**مەحمود:** بەڵام.. بەڵام شتێکی ترسناك بوو، هەرچەند دەمویست لە بیر خۆمی بەرمەوە کەچی هەر بیرکردنەوەی داگیری دەکردەوە.. ئا.. ئاه..

**مەسعود:** ڕادێی.. ڕادێی.. منیش وەکو تۆ کە بۆ یەکەمجار دەستم لە مردودا هەروام لێهات (ئەکۆکێ) مەحمود، تۆ کارت نەبێ لەمەودوا بە هیچ جۆرێ داوات لێناکەم دابەزیتە ناو قەبرەوە، هەرگیز کارێکی وات پێ ناسپێرم.. بەڵام ئەوەندە هەیە جێم مەهێڵە (بە توندی ئەکۆکێ)..

**مەحمود:** (بە چپەیەکی قوڵ) باشە ئەی دیمەنی پیاوەکان؟

**مەسعود:** دیمەنی پیاوەکان؟ باشە ئەوانیش ترس ئەنێتە دڵتەوە؟

**مەحمود:** ناتوانم لەو پیاوانە بڕوانم کە دەگریێن و ناوچەوانیان ئەچێتە خۆڵەوەو باڵایان قوڕاوی دەبێ، یا وەکو ژنان ئەکڕوزێنەوە.

**مەسعود:** باشە، بۆ ئەو دیمەنە تازەیە بەلاتەوە؟

**مەحمود:** نا، بەڵام دیمەنی ئەو پیرەمێردەی، کە بۆ بەدبەختی من کوڕەزاکەیم ناشت، کەچی هاواری کردو خۆیدا بە سەرماو وتی: لە هەموو دنیادا هەر ئەوم هەیە، لە بری ئەو من بنێژە، دەموچاویم نیشان بدە با ماچی بکەم.

دە بێبەزەیی هیچ نەبێ با ماچی بکەم، کاتێکیش ویستم بەقسەی بکەم تۆ نەتهێشت.. پاڵت پێوە ناو قیژاندت بەسەریا، کابرا خۆ ڕۆژەکە بە ناشتنی تاکە مەیتێکەوە ناکوژین، ئیتر پیرەمێردەکە خۆی لە زەویەکە ئەگەوزاندو ئەگریا.. گریانێك ئاسنی ئەتوانەوە.. لەو پیرەمێردەدا باوکم و لە کوڕەزاکەشیدا خۆم ئەبینیەوە، لەو کاتەدا پڕ بە دڵ ئارەزوم ئەکرد ئەرزەکە قوتم بدا، زۆر قورس بوو، قورس بوو بە ڕادەیەك ترسام.. و.. و.. هیچ ئاسودە نەبووم هیچ.

**مەسعود:** باشە کێ ئەڵێ، ئەوە منیش ئاسوودە ئەکا، وەك هەمیشە وتومە دەرگای ڕزقەکەمان لەوێوەیە.

**مەحمود:** دەرگای تریش هەیە بۆ ڕزق (مەسعود ئەکۆکێ) با لە دەرگایەکی تر بدەین.

**مەسعود:** دوای پەنجا ساڵ؟

**مەحمود:** بۆ هەر کەسێ کە بیەوێ شێوازی ژیانی بگۆڕێ، هەمیشە ماوە هەیە.. بۆ گۆڕین

**مەسعود:** ئەوە بۆ کەسێکە بیەوێ، من نامەوێ.

**مەحمود:** (بە خەمۆکی و ئازارەوە) ئەزانم.. گۆڕهەڵکەندن لەلای تۆ بۆتە جۆرە ئارەزوویەك.

**مەسعود:** (ئەقیژێنێ) کوڕە ووریا بە شوێنی لێ هەڵئەکێشی (ئەکۆکێ) ئەوە تەنیا سەرچاوەی ڕزقەکەمەو هیچی تر.

**مەحمود:** سەرچاوەی ڕزق لەبەردەم گێژاوی ڕێکەوتا، دەکەوێتە ناو حاڵەتی هەڵکشان و داکشانەوە.

**مەسعود:** ئەویش وەك هەر شتێکی تری ئەم زەمەنە خراپە.

**مەحمود:** نەخێر، هەڵکشانەکەی درندە و داکشانەکەشی کوژەرە، بەڵێ مام مەسعود کوژەرە.

**مەسعود:** مەحمود، بڕۆ بەلای کاری خۆتەوە (بە بێزرانێکەوە) بڕۆ، دەی بڕۆ.

**مەحمود:** بڕۆم.. بۆ کوێ بڕۆم؟

**مەسعود:** بۆ کوێ ئەڕۆی.. بڕۆ.. بڕۆ بۆ دۆزەخ.. وازم لێبێنە.. وازم لێبێنە.. کەرەسەکانی هەڵدەگرێ و دەڕوا بۆ هەڵکەندنی تر)

**مەحمود:** بەدویدا ئەڕوا، هەروایە ڕۆژانی داکشان ئەوپەڕی ئاسودەییە و لە خۆشیدا باڵ دەگریتەوە.. بەڵام من هەر ناخەوم دیمەنی پیاوە تۆزاویەکان ئەینە دەرزی بێ خەوی و ئازار، دیناره هەڵکێشراوەکانیان لە فرمێسك و خوێن، ئەبنە ئاگرو دەمبرژێنن، بەڵام ڕۆژەکانی تر کە پیاوی قوڕاوی نابینیت، خەمۆکی داتئەگرێ هەروەك ئازیزێکت ون کردبێ، ئیتر ئەڕۆیت و هەڵدەکەنی، بەڵکو خوا یا شەیتان کە هەردووکیان بۆ تۆ چون یەکن بە هاناتەوە بێن، منیش لە ناوەوەی خۆما دائەڕزێم، من ئەزانم تۆ خاوەن خێزانی و ئەو ڕۆژەی شتێکت دەست نەکەوێ نە خۆت نە خێزانت هیچ ناخۆن، منیش وەك تۆ لە خوا ئەپاڕێمەوەو نزام ئەنێمە ئاهی پڕ نزولەت، ئەو نزایەی کە لە ناختەوە هەڵئەقوڵێ.. بەڵکو.. ئێ.. بەڵکو.. ئای چەند دزێوە..

**مەسعود:** "وەك ئەوەی لە هۆش خۆی چووبێ".. بەڵکو.. ئێ.. بەڵکو..

**مەحمود:** (بە ترسێکەوە) بەدەم نزای منەوەبێ؟ بەڵکو.. بۆنا.. بەدەن.

**مەسعود:** (دەلەرزێ).. هەی تۆو نزاکەت لەناوچن.. گەمژە.. هەی..

**مەحمود:** مام مەسعود.. ئێی مام مەسعود.. ئەگەر ئەتزانی.. ئەو دەمانەی کە ئەتبینم لەگەڵ ئاوابوونی خۆرا تۆش ئەکوژێیتەوەو بە مل کەچی و گیرفانی خاڵیەوە ون ئەبی، بێ ئەوەی کەسێ بنێژی.. ئەگەر ئەتزانی چۆن دائەهێزرێم.

"خۆی ئەدا بە سەریاو.. زۆر بە کوڵ ئەگری"

**مەسعود:** (تاوێك گرژ دەبێ، پاشان بە سۆزێکەوە دەکێشێ بە پشتیا). بەسە مەحمود بەسە کوڕم.. وەرە.. وەرە هەڵکەنە لە گەڵما، لە جیاتی ئەوەی.

**مەحمود:** هەڵکەنین؟ زیاتر هەڵکەنین؟ بۆ کێ؟ لە سێ گۆڕ زیاترت هەڵکەندووە بێ ئەوەی کەسێك بیگرێ. (بە تۆنێکی سەیر) یەکێکیان بێنم (خۆی پێ دەسڕێ)

**مەسعود:** بێدەنگ بە (بە توندی پاڵی پێوە ئەنێ)، شەیتان بتباتەوە بۆ خۆی چەند ڕەزاگرانی.. (ئەکۆکێ)

**مەحمود:** هەر ئەوەیە کە لە مێژە بیری لێ ئەکەمەوە.. ئەی ئەدەبوو من..

**مەسعود:** تۆ شێتی.. شێت و درندەی..

**مەسعود:** تۆ باوانمت لە مردنێکی مسۆگەر ڕزگار کرد، پێویستە ئەو چاکەیەت بدەمەوە.

**مەسعو:** (گرژ دەبێ) هەی تۆو باوانیشت بەر لەعنەتی خوا بکەون.. ئەو سەعاتەش کە..

**مەحمود:** خۆ تا هەتایە کۆیلەی چاکەی تۆ نابم، خۆ ئەگەر باوانیشم دەستەوستان بن لە..

**مەسعود:** مەحمود.. تۆ شێتی.. هەر بە ڕاستی شێتی، نازانی چی ئەڵێی، هیچ کارێ ناکەی..

**مەحمود:** گەورەم من کۆیلەی تۆم.. هەر فەرمان بدە، تا لە یەکێك لەو چاڵانەدا درێژ بم.. کەسی لێ نیە.. دەی خۆڵم بەسەرا بکە، دەی کەس نامانبینێ (ئەچێتە لای چاڵەکەو، مەسعود بە توندی پاڵی پێوە ئەنێ).

**مەسعود:** مەحمود، بەزەییت پێمابێتەوە، لەبەرچاوما ون بە، (سەردڵی خۆی ئەشێلێ)

**مەحمود:** من خۆشم ئەوێی.. ناتوانم لێت جیابمەوە..

**مەسعود:** (هاوار ئەکا) مەحمود بەسە لەگەڵما.. مەحمود.. مەحمود.

**زێوان:** (لە دوورەوە دەنگی دێ) مەحمود؟ ئەرێ مەحمود هات (پاشان) مەسعود بۆم نانێری.

**مەسعود:** (بە تەوسەوە) بڕۆ.. بڕۆ بۆ لای زێوانەکە بانگت ئەکا..

**مەحمود:** (پەنای بۆ دەبا) نا.. تکا ئەکەم.. نا..

**زێوان:** مەحمود.. مەحمود.. کوڕم.. پیاوەتیەکم لەگەڵ ناکەی..

**مەسعود:** دەی.. دەی.. ئەو پێویستی پێتە..

**مەحمود:** نا.. تۆ.. تۆ.. پێویستیت بە منە..

**مەسعود:** نا.. نا.. بڕۆ ئەگینا سەرت داغان ئەکەم (بە تەورەکەوە پەلاماری ئەدا)..

**زێوان:** مەحمود، گوێت لێم نیە، دەوەرە پاکەتێ جگەرەم بۆ بکڕە.

**مەحمود:** (بەرەو دەنگەکە ئەڕوا) مامە خەلیل ئەوا هاتم.. ئەوا هاتم.. (پێش ئەوەی ون ببێ دەوەستێ): مام مەسعود.. هەر ئێستا دێمەوە.

**مەسعود:** (تەورەکەی تێ ئەگرێ) جنۆکەکانی دۆزەخت لەگەڵ (مەحمود تەورەکە ئەشارێتەوەو ون ئەبێ، مەسعود هاوار ئەکا) ئاخ.. ئاخ.. (سەردڵی خۆی ئەشێلێ، لە تر ئەدا، کۆکە تینی بۆ ئەهێنێ.. دان بە خۆیدا ئەگرێو بەرەو کوپە ئاوەکە ئەڕوا.. کوپەکە ئەکەوێ، وەك پەرگەم گرتویەك لەخۆڵەکەدا ئەگەوزێ، ئەیەوێ هەڵسێ بەڵام ناتوانێ، بە دەنگێکی کرختی تێکەڵ بە کۆکە) مەحمود.. کو.. و.. و.. وو.. ڕم.. مەحمود دوو.. (بە تەواوی لە جوڵە ئەکەوێ)

**مەحمود:** (لە دوورەوە دەنگی دێ) مامە.. مام مەسعود تەرمی زێوانەکەی بەسەر شانەوەیە کە سەری بە خوێن شەلاڵە.. مامە.. مام مەسعود.. (تەرمەکە فڕێ ئەداتە ئەو چاڵەوە کە مەسعود بۆی ئامادە کردووە، ئەگەڕێتەوە بۆ لای مەسعود، ئەیجوڵێنێتەوە، تاوێك ڕادەمێنێ، جلەکانی لەبەر دائەکەنێ و لەبەر خۆیی ئەکا.. مەسعود دەباتە لای ئەو چاڵەی کە خۆی سەرەکەی لابردبوو.. دەینێژێ و گڵی بە سەردا ئەداتەوە.. ئینجا ئەگەڕێتەوە بۆ لای زێوانەکە.. گڵ بەسەر ئەویشدا ئەداتەوە خاکەنازەکە هەڵئەگرێ، بۆ شوێنێکی تازە ئەگەڕێ، زۆر چالاك و چاپوکانە بە پێچەوانەی جەستە لاوازەکەیەوە ئەکەوێتە هەڵکەندن).



# گوڵەکان بۆ کێن؟

وەرگێڕانی: ئازاد بەرزنجی

**کاراکتەرەکان..**
**(دایك، کوڕ، دوو ئافرەت، سێ پیاو)**

*(باخچەیەکی ئاوەدانە دەوری ساختومانێکی بەرزی داوە، تەنها ڕووی پێشەوەی ساختومانەکە دیارە کە پەنجەرەی فراوانی هەیەو پەردەکانی دادراونەتەوە، کورسیەکی دارینی جوان هەیە بە سپی ڕەنگ کراوە، بەیانیی ڕۆژێکی پایزە، تازە خۆر هەڵهاتووە، کۆترە کێویلەکان لە نێو گیاکاندا خەریکی دان خواردنن، خانمێك تەمەنی چل و دوو ساڵە، خاوەن جوانیەکی تایبەتیە، بەرگێکی ڕەشی پۆشیوە، سیحرێکی تایبەتیی پێ بەخشیوە، شاڵێکی ڕەشی لە خوری دروستکراوی بە شانیدا داوە، جگە لە جانتا ژنانەکەی دەستی، جانتایەکی بچووکی جلوبەرگی پێیە، دێتە باخچەکە، کوڕەکەی کە تەمەنی نزیکەی بیست ساڵێك دەبێ بە دوایدا دێت، کە دێن کۆترەکان دەفڕن، کوڕەکە بە دوای کۆترێکیاندا ڕادەکات تا بیگرێت.. کۆترەکە دەفڕێت و لە شەقەی باڵ دەدات).*

**کوڕ:** *(بە خەمەوە)* فڕی.. بە داخەوە.. چەند حەزدەکەم کۆترێکم هەبێ.

**دایك:** *(شاڵەکە دەدات بە سەر کورسیەکەداو بە تەواوی کورسیەکەدا دەپۆشێ.. جانتای جلوبەرگەکەش لە ژێریدا دەشارێتەوە)*.. وەرە.. وەرە..

**کوڕ:** *(لێی نزیك دەبێتەوە)* من خۆشم دەوێ، کەچی ئەو منی خۆش ناوێ، هەمیشە لە دەستم ڕادەکات.

**دایك:** *(جێی لەسەر کورسیەکە دەکاتەوە)* دانیشە کوڕم.. دانیشە..

**کوڕ:** لێرە؟ لێرە یەکتری دەبینین؟

**دایك:** بەڵێ *(پاشان)* بە دڵت نیە؟

**کوڕ:** *(منێشتا بە پێوەیە، چاوێك بە شوێنەکەدا دەخشێنێ)* لەوە دەچێ شوێنێکی خراپ نەبێ.

دایك: بەڵکو خۆشە.. دەبێ بڵێی شوێنێکی خۆشە

کوڕ: جا وایە؟

دایك: تەماشاکە.. چۆلەکە و کۆتر و گوڵ و ئاو و درەخت و خۆر.. خۆرێکی گەرمی بە سۆز.. تینی خۆیمان پێ دەبەخشێ.. ئاە.. شوێنێکی بژوێنە.

کوڕ: ئێرە.. ئێرە.. وەکو تۆ دەڵێی.. شوێنێکی خۆشە.

دایك: وەکو من دەڵێم؟ ئەی خۆت ناتوانیت هەست بەوە بکەیت؟

کوڕ: ها.. نازانم.

دایك: *(بە ئازارەوە)* ئاە.. *(بێ دەنگی.. کوڕەکە لە شوێنەکە ڕادەمێنێ)*.. ها.. بە دڵتە؟

کوڕ: *(خەیاڵی ڕۆیشتووە)* وا.. وا بزانم.. وا بزانم بە دڵمە.

دایك: وا بزانیت؟ واتە.. دڵنیا نیت..

کوڕ: دەشوێنێت و.. ئاشوبهێنێتە سەر هەندێ شوێن.. کە بینیومن و.. خۆشمویستوون.

دایك: نا.. نا.. ئێرە ئاشوبهێنێتە سەر هیچ یەکێ لەو شوێنانەی لە مەوبەر بینیوتن.

کوڕ: ها؟

دایك: هەرگیز لەمەوبەر شوێنێکی وەك ئێرەت نەبینیوە.. ئەم جۆرە شوێنانە زۆریان تێ دەچێت.. ئێمەش هەرگیز بۆمان نەڕەخساوە کە سەردانیان بکەین.

کوڕ: ئەی ئێستا؟

دایك: *(بەخۆشیەوە)* ئێستا هەروەکو دەبینیت.. هاتووینەتە ناویەوە.. پێویستە لەم هاتنەمان چێژ وەربگرین.

کوڕ: بڕوا ناکەم بتوانم.

دایك: بۆچی؟

کوڕ: لەو شوێنە زۆر دڵنیا نیم.. من.. من.. لێرە هەست بە دڵنیایی ناکەم

دایك: *(دەنگی گرژ دەبێ)* ئاخ.. خوایە *(خەریکە دەگری)* ئەگەر دەتزانی چەند لە سەرم کەوتووە.. ئاخ.. ئەگەر دەتزانی..

کوڕ: *(بە ساویلکەییەوە)* نازانم.. پێت نەوتم.

دایك: شتێکە ناوتری.. شتێکە نرخی بۆ دانانرێت.. ئاخ.. کلۆڵیم.

*(دەست بە دەم و چاویەوە دەگرێ)*

کوڕ: *(بە بێ ئەوەی تێبگات)* ب.. ب.. بۆچی.. ب..ب

دایك: لەبەر ئەوەی هیچی ترم شك نەدەبرد.. هیچی ترم شك نەدەبرد تا کامەرانیی تۆی پێ بکڕم.

کوڕ: کامەرانیی من؟

دایك: کامەرانیی خۆشم.. خۆت دەزانیت بە بێ کامەرانیی تۆ شتێکی هیچە.. ئازارە.. مردنە.. کوشتنە *(دەگری)* ئاخ خوایە.. لێبووردنت.. خوایە.. بەزەییت.

کوڕ: دایە.. دایە.. مەگری.. تکات لێ دەکەم.. مەگری.. خۆشم دەوێ.. ئەم شوێنەم خۆش دەوێ.

دایك: *(گومان دەکات)* بە.. ڕاستە؟ بە ڕاستە کوڕە خۆشەویستەکەم؟؟

کوڕ: بەڵێ.. دایە.. بەڵێ.

دایك: ئۆە.. پێم خۆشە.. زۆرم پێ خۆشە.

کوڕ: ئیتر.. زوو زوو بۆ ئێرەش دێم..

دایك: *(بە هەڵچوونەوە)* نا.. نا.

کوڕ: *(بەسەر سوڕمانەوە)* نا..؟!

دایك: *(دەرك بە هەڵچوونەکەی خۆی دەکات)* لە دڵەوە ئاوات دەخوازم.. لێرە دەربچیت و بۆی نەگەڕێیتەوە.. هەرگیز.

کوڕ: لەبەر ئەوەی زۆری تێ چووە..؟

دایك: لەبەر ئەوە.. لەبەر ئەوەی.. *(دەوەستێ)* بەڵام.. بەڵام بۆچی.. دەتەوێ زوو زوو بۆ ئێرە بێیت؟

کوڕ: من.. من نامەوێ.. ئەو.. ئەو دەیەوێ.

دایك: مەبەستت کێیە؟

کوڕ: کچەکە.. کچە جوانەکەی کە تۆ بەڵێنت دامێ لێرە بیبینم.

دایك: ئ.. ئ.. بیرم کەوتەوە.

کوڕ: *(بە خەیاڵ کردنەوەوە)* داوام لێ دەکات.. هەموو ساڵێك.. بە یادی یەکەم جاری یەکتر بینینمانەوە لەو شوێنەدا کە یەکترمان تێدا بینی ئاهەنگ ساز بکەین.

دایك: ئ.. ئ.. وایە.. وایە هەموو ئافرەتێك داوای.. ئەوە دەکات.

کوڕ: بەڵام ڕەنگە من نەتوانم ساڵێکی ڕەبەق.. چاوەڕێ بکەم

دایك: بۆچی؟

کوڕ: *(بە دەنگێکی خەمگینەوە)* ساڵ.. زۆر درێژە..

دایك: *(وەکو ئەوەی لەگەڵ خۆی بدوێت)* ڕاست دەکەیت.. درێژە.. زۆر درێژە..

کوڕ: *(بە چوست و چالاکیەوە)* هەموو هەفتەیەك لە گەڵیدا ئاهەنگ ساز دەکەم

دایك: هەموو هەفتەیەك؟

کوڕ: *(بە پاشگەز بوونەوەوە)* کورتە؟ زۆر کورتە.. مەبەستم ئەوەیە.. زۆر کەمە؟

دایك: ڕ.. ڕەنگە.. ڕەنگە..

کوڕ: کەواتە هەموو.. هەموو.. *(بیر دەکاتەوە)* هەموو کۆمەڵە هەفتەیەك دەبێت؟

دایك: دەبێ.. خۆشەویستم دەبێ.. *(بێدەنگی)* بۆ.. بۆ.. دانانیشیت؟ ماندوو نەبوویت؟

کوڕ: *(لای دایکیەوە دادەنیشێت)* ئەوە وام لێ ناکات.. لەبەر.. چاوی سووك بم؟

دایك: بۆچی بڕوات وایە؟

کوڕ: من بڕوا ناکەم.. کوڕەکانی گەڕەکەمان وا دەڵێن.

دایك: دەڵێن چی؟

کوڕ: دەڵێن دەبێ پیاو هەروا بە ئاسانی خۆی بە دەست ئافرەتەوە نەدات.. دەبێ.. دەبێ.. خۆی قورس ڕابگرێت.. بە تایبەتی لە سەرەتای یەکتر ناسینیاندا.

دایك: بۆچی؟

کوڕ: بۆ ئەوەی ئافرەتەکە زیاتر خۆی پێوە هەڵواسێت.. بە شێوەیەکی بەهێزترو توندتر و پتەوتر *(بە جوولەی دەستی ئەوە پیشان دەدات، پەنجەکانی هەردوو دەستی خۆی لە یەك دەئاڵێنێ و پاشان لە یەکیان دەکاتەوە.. هتد)* ئایا.. وایە؟

دایك: لە ڕاستیدا نازانم، لەمەوبەر بیرم لەمە نەکردووەتەوە.

کوڕ: ئەی.. ئەی.. باوکم؟

دایك: چیەتی؟

کوڕ: چۆن بە یەکتری گەیشتن؟

دایك: هەروەکو خەڵکی..

کوڕ: مەبەستم ئەوەیە لە کوێ؟ لە چ شوێنێك؟ هەر لێرە..

دایك: ئۆە.. ئەو.. بێگومان ئەو..؟

کوڕ: واتە.. لە ژێر تیشکی گەرمی خۆر و لە ناو گوڵ و باڵندە و

دایك: ئەو.. ئەفسووس.. ئەو..

کوڕ: کەواتە لە کوێ.. دایە.. لە کوێ؟

دایك: ئۆە.. واز لەوە بهێنە کوڕم.. ئەوە بەسەرهاتێکی کۆنە.

کوڕ: بۆ.. بۆچی لە کۆندا شوێن نەبووە خەڵکی یەکتری تێدا ببینن؟

دایك: هەبووە.. هەمیشە شوێن هەیە، هەر لە سەرەتای بوونی مرۆڤەوە و هەتا هەتایەش هەر دەبێ.

کوڕ: ئەی.. ئەی ناگۆڕێت؟

دایك: دەگۆڕێت.. هەموو شتێك دەگۆڕێت..

کوڕ: بەڵام ئێوە سەرباری ئەوەش ناسیوتانە.. بە یەکەوە بۆی چوون..

دایك: *(خەیاڵ دەکاتەوە)* بۆی؟ بۆ کوێ؟

کوڕ: بۆ ئەو شوێنەی یەکەم جار یەکترتان تێدا بینی.

دایك: *(تۆزێك بە جیددی)* نا.. بە یەکەوە بۆی نەچووین.. هەرگیز.. هەرگیز.

کوڕ: *(بە سەرسوڕمانەوە)* سەیرە.. بۆچی؟

دایك: لەبەر ئەوەی هەرگیز پێم خۆش نەبوو.. تا داوای لێ بکەم بۆی بچین.

کوڕ: ئەی ئەو؟

دایك: ئەویش.. پێی خۆش نەبوو.. بڕواناکەم کەس ئەو.. شوێنەی پێ خۆش بێت، ئەگەرچی ناچاریش بێت تیایدا بژی.

کوڕ: بۆچی؟

دایك: لەبەر ئەوەی شوێنێکی پیسە.. هەناسە تەنگ دەکات.. تاریکستانە.. تەنانەت خۆریش بە شەرمەوە تیایدا نامێنێتەوەو.. خۆی پێدا ناکات.

کوڕ: کەواتە بۆچی شوێنێکی.. ئاوەها تەنگ و ناخۆشتان هەڵبژارد..

دایك: ئێمە خۆمان هەڵمان نەبژارد؟ *(وەڵام ناداتەوە)* دایکی؟

دایك: *(بە دەم زمان تەتەڵەکردنەوە)* ن.. نە

کوڕ: دایکت؟

دایك: ئەو.. ئەو.. بەختە ڕەشەکەم.

کوڕ: بەختت؟ یانی چیی بەختت؟

دایك: کوڕم.. گوێ بگرە.. ئەوە مەسەلەیەکە کە دێتەوە یادم هەست بە شورەیی دەکەم.. تۆش بەزەییت بە دایکتدا بێتەوەو.. لە بیر خۆتی بەرەوە.

کوڕ: بەڵام چی پاڵی پێوە نایت.. خۆشەویستی..

دایك: *(قسەکەی پێ دەبڕێت)* بارودۆخ.. هەندێ بارودۆخی.. سەخت و ناهەموار.. کە لە من بەهێزتر بوون پاڵیان پێوە دەنام لەو نزیك ببمەوە.. و.. ئەو بارودۆخانە لە سایەی ئەوەوە گۆڕان.. لە سایەی ئەو مرۆڤە بەرزەوە.. کە خاوەن دڵێکی مرۆڤانەی مەزن بوو و گوێی نەدەدا بە کۆمەڵێك پێودانگ و نەریت و منی ڕزگار کرد.. ئەگەر ئەو نەبووایە.. ئەگەر خۆشەویستیە مەزنەکەی ئەو نەبووایە.. کرم دایدەڕزاندم و دەیکوشتم.. و دەبوومە مشتێ ئێسقانی ڕزیوو بۆگەن.

**دایك:** ئەی کێ.. کێ جگە لەو مرۆڤە خاوەن ئەقڵ و دڵە گەورەیەی ئابڕوو و ناوی خۆی بەخشی بە ئافرەتێك کە خەریك بوو دەبووە پاشماوەیەکی مرۆڤایەتی *(کوڕەکە هەناسە هەڵدەکێشێت، ئافرەتەکە بە ئاگا دێتەوە)* چیتە کوڕم؟

**کوڕ:** کاتێ گوێت لێ دەگرم کە ئاوەها بە سەرسوڕمانەوە باسی باوکم دەکەیت.. لە شوێنێکی دەروونمدا ئازارێکی توند دەتەقێتەوە بۆچی من نەمبینی؟ بۆچی؟ بۆچی؟

**دایك:** فەرمانی چارەنووس زۆر جار زاڵم و نامرۆڤانەیە.. زیاد لە پێویست، کۆرپەلەیەك لە هەناومدا هەبوو، تۆوێکی بچکۆلە.. پیاوێك لە زەویەکی بە پیتدا چاندی.. کەچی چارەنووس دەرفەتی نەدا تا ببینێ چۆن گەشە دەکات و گەورە دەبێت.. *(کۆترێك لێیان نزیك دەبێتەوە، کوڕەکە چاودێری دەکات و سەیر دەکات، لە دایکی و قسەکانی غافڵ دەبێت)* بەڵام تکام وایە بەزەیی بە حاڵمدا بێتەوە.. بهێڵێت ئەو درەختەی لەو تۆوە باشەوە سەری دەرکرد نەشونما بکات و بەربگرێ.. تا دەبێتە درەختێکی بەرز و.. ئەو کاتە لە ژێر سایەیدا دەحەسێمەوەو لە بەرەکەی دەخۆم *(کوڕەکە بە پێدزکە ڕووەو کۆترەکە هەنگاو دەنێ)* ئەو ساڵ و ڕۆژانەی لە تەمەندا ماومە بە سەربەرزی ئابڕوومەندیو.. دڵنیاییەوە لە پاڵیدا بژیم.. ژیان و زەبر و زەنگی ژین ناچارم نەکات جارێکی دی بگەڕێمەوە ئەو زیندانە بەڵایە..

**کوڕ:** *(بە وردیەوە لە کۆترەکە نزیك دەبێتەوە، پاشان لە پڕدا خۆی هەڵدەدات بە سەریدا)* کۆترەکە دەفڕێت و ئەمیش دەکەوێتە سەر زەوی، ئازاری پێ دەگات و هاوار دەکات) ئاخ.. دایە..

**دایك:** کوڕەکەم *(بە پەلە بۆ لای دەچێت، لە زەویەکە بەرزی دەکاتەوە، ئەو گیاو دڕکانەی بە دەموچاو و جل و بەرگەکەیەوە دەلکێن لێیان دەکاتەوە)* ئاهـ.. ئاهـ.. بۆ.. بۆ وا لەخۆت دەکەیت.. ئای خوایە.

**کوڕ:** کۆترەکە.. دایە.. کۆترەکە فڕی.

**دایك:** چیت لە کۆتر داوە.. خۆ منداڵ نیت.. نابێ خۆت بەو شتانەوە خەریك بکەیت کە منداڵ خۆی پێیانەوە خەریك دەکات.. تەماشا.. تەماشا چیت لە خۆت کردووە.

**کوڕ:** داوای.. لێ بووردن دەکەم.

**دایك:** جا تازە سوودی لێبووردن چیە.. ئاهـ.. خوایە.. ئەوەندەی نەمابوو بۆ کۆترێك ملی خۆت بشکێنیت

**کوڕ:** من خۆشم دەوێ.. دایە خۆشم دەوێ.

**دایك:** ئەمە چ خۆشەویستیەکە.. چ خۆشەویستیەك.. دەیگریت و تووکەکەی لێ دەکەیتەوە.. وەکو پارچە گۆشتێکی ڕووت و قووت بەرەڵای دەکەیت.. خۆشەویستی وەها نابێت.. وەها نابێ.. هەرگیز.. هەرگیز.. پێویستە واز لەو کردەوەیەت بهێنیت کوڕم.. پێویستە دەستبەرداری ئەم جۆرە شادیە نەگریسە بیت

**کوڕ:** نەگریس..!!

**دایك:** لەوپەڕی نەگریسیدایە.. زیاد لە جارێك پێم وتویت.. بەڵام قسە بە گوێتدا ناچێت.

**کوڕ:** من.. من.

**دایك:** بەسە.. بەسە.. وەرە دەموچاوت بشۆم *(دەیباتە پشت کورسیەکە، جۆگەلەیەك بەوێدا تێیدەپەڕێت، دەموچاوی دەشوات)* ئێستاش بەڵێنم بدەرێ جارێکی تر شتی وا نەکەیت.. هەرگیز.. هەرگیز.

**کوڕ:** بەڵێنت دەدەمێ دایە.. بەڵێنت دەدەمێ.. هەر تۆ تووڕە مەبە.

**دایك:** من تووڕە نابم.. بەڵام ئەگەر شتی وا بکەیتەوە.. تووڕە دەبم

**کوڕ:** نا.. نا.. شتی وا ناکەم.. شتی وا ناکەم.. هەرگیز..

**دایك:** باشە.. باشە.. منیش بووردام.

**کوڕ:** بە ڕاستتە دایە.. بە ڕاستتە.. لێم بووردایت؟

**دایك:** بێگومان کوڕە شیرینەکەم.. چونکە من تۆم خۆش.. دەوێت.. هەر کەسێکیش خۆشەویستیی لە دڵدا بێت لێبووردنیشی لە دڵدایە

**کوڕ:** ئەی.. ئەی.. ئەی.. ئەویش لێم دەبووری.

**دایك:** ئەو؟! ئەو کێیە؟!

**کوڕ:** هەمدیسان لە بیرت چووەوە؟

**دایك:** *(دوای تاوێك)*.. بێگومان.. بێگومان لێت دەبورێت

**کوڕ:** یانی.. یانی.. منی خۆشدەوێ.. ئەویش وەکو تۆ منی خۆش دەوێ *(دایکی بە زەردەخەنەوە سەری ئەرێ دەجوولێنێ)* گەرچی ئە ئەو منی بینیوەو.. نە منیش ئەوم بینیوە.

**دایك:** ئەو هەمیشە تۆ دەبینێ.. مەبەستم ئەوەیە دەتهێنێتەوە پێشچاوی خۆی.. لە خەیاڵیدا وێنەت دەکێشێ.

**کوڕ:** ئەی من..؟ من..؟ بۆچی ئەو نابینم.. بۆچی ناتوانم بیهێنمە پێش چاوم.

**دایك:** دەتوانیت.. تۆش ئەگەر هەوڵ بدەیت.. دەتوانیت..

**کوڕ:** چۆن؟ دایە. چۆن؟

**دایك:** *(بە سەرسامیەوە)* ئا.. چۆن.. ڕاستە.. چۆن وام لێهاتووە درۆ دەکەم بە بێ ئەوەی ئەنجامەکەی ڕەچاو بکەم.

**کوڕ:** ها.. دایە.. فێرم بکە.. دەمەوێ بیبینم.

**دایك:** باشە.. باشە *(بیر دەکاتەوە.. پاشان لە پڕدا)* چاوت بنووقێنە *(کوڕەکە چاوی دەنووقێنێت)* هەردوو چاوت.. باش بیانتوقێنە.. ئێستاش.. جڵەو بۆ خەیاڵت شل بکە.. مەبەستم ئەوەیە.. خەیاڵ بکەرەوە.. خەیاڵ بکەرەوە.

**کوڕ:** خەیاڵ لە چی بکەمەوە؟

**دایك:** خەیاڵ لە کچێکی جوان بکەرەوە.. جوانترین کچ کە.. دەتوانیت خەیاڵی لێ بکەیتەوە.

**کوڕ:** *(دوای ماوەیەکی کەم.. بە شادیەوە)* دایە خەیاڵم کردەوە.. بینیم.. وەکو تۆ وایە.

**دایك:** *(بە هەستێکی دژوارەوە)* وەکو من؟ دەڵێم جوانترین کچ کە دەتوانیت خەیاڵی لێ بکەیتەوە کەچی دەڵێیت.. وەکو تۆ.

**کوڕ:** تۆ جوانترین ئافرەتی لە ژیانمدا دیبێتم.

**دایك:** لەبەر ئەوەی ئافرەتی ترت لە ژیانتدا نەدیوە.. بەسەزمان..

**کوڕ:** بەڵکو تۆ..؟

**دایك:** بەسە کوڕم.. بەسە.. با لەوە زیاتر هەست بە نائومێدی و کڵۆڵی نەکەم..

**کوڕ:** دایە.. هیچ قسەیەکم کردووە ئازارت بدات؟

**دایك:** بەخوا نازانم ئەوەی وتت ئازارم دەدات یا شادمانم دەکات.

**کوڕ:** چۆن نازانیت؟! قسە یان مرۆڤ شادمان دەکات، یان ئازاری دەدات.

**دایك:** دەشێ لە هەمان کاتدا قسە سەرچاوەی شادمانی و ئازاریش بێت.

**کوڕ:** هەرگیز شتی وام نەبیستووە.. گوایە قسە هەبێت لە هەمان کاتدا سەرچاوەی شادمانی و ئازاریش بێت.

**دایك:** وا بیستت.

**کوڕ:** ئیتر وریاتر دەبم.. لەم ساتەوە هیچ قسەیەك ناکەم ئەوە نەبێت کە کامەرانت دەکات و بەردەوام دڵت شاد دەکات.

**دایك:** تەنها دڵی من؟ *(زەردەخەنەیەك سەر لێوی دەگرێت)*

**کوڕ:** دڵی ئەویش *(دایکەکە زیاتر زەردەخەنە سەر لێوی دەگرێت و.. ڕووی دەگرێتەوە)* مرۆڤ کاتێك دڵی خۆش دەبێت ڕووخساریشی جوانتر دەبێت. *(زەردەخەنەیەکی بۆ دەکات)*.

**دایك:** کەواتە هەمیشە با دڵت خۆش بێ کوڕەکەم.. بەوە دڵی ئەوانەش خۆش بکە کە خۆشیان دەوێیت

**کوڕ:** دڵی ئەویش پڕ لە شادی دەکەم.

**دایك:** چۆن؟

**کوڕ:** دیاریەکی پێشکەش دەکەم دڵی پڕ لە شادی بکات، بۆ ئەوەی ڕووی هەڵبێت و بگەشێتەوە.. وەکو ڕووی تۆ.

**دایك:** ڕووی من ئاوێنەی ئەقڵی تۆیە.. کاتێك ئەقڵت ڕووناك دەبێتەوە.. بێگەردی و جوانی و ڕۆشنایی لە سەر ڕووی من ڕەنگ دەداتەوە.. دڵم لە ئازار و خەم پاك دەبێتەوە، ئەوەندە بەسە بە ئاقڵی و قسەی ڕێك و پێکەوە بتبینم تا باڵی شادی بۆ ئاسمانێکی بێ سنوور بمفڕێنێت.. پێم بڵێ.. خۆشەویستەکەم..؟

**کوڕ:** بەڵێ.. دایە

**دایك:** ئەم دیاریەت چۆن بە بیردا هات و لە کێوە فێر بوویت؟؟

**کوڕ:** لە تەلەفزیۆنەوە.

**دایك:** بەڵێ؟!

**کوڕ:** هەمیشە لە تەلەفزیۆن و.. لە سینەمادا خەڵك دەبینم و لێیان دەبیستم کە دڵدارەکان دیاری و شتی تر بۆ یادگاری پێشکەشی یەکتر دەکەن

**دایك:** وەکو.. چی؟

**کوڕ:** وێنە، بە زۆری دەیانبینم وێنە لە نێوانیاندا ئاڵ و گۆڕ دەکەن

**دایك:** شتێکی جوانە..؟

**کوڕ:** کچەکە وێنەی خۆی دەدات بە کوڕەکەو کوڕەکەش وێنەی خۆی دەدات بە کچەکە. *(بێدەنگیەك)* دایە.. ئەو وێنەی خۆیم دەداتێ؟!

**دایك:** ئەگەر حەز بکەیت نا.. بەڵام تۆ وێنەی ئەوت بۆ چیە مادام خۆیت لەگەڵدایە، مەبەستم ئەوەیە لەگەڵتدا دەبێت؟

دایك: *(بە چرپە، وەك ئەوەی لەگەڵ خۆی بدوێت)* ئەمیش هەر وەکو ئەو.. وەکو ئەو؟

کوڕ: بەڵکو.. وەکو تۆ.

دایك: من..

کوڕ: تۆ بە وەفایت.. دڵسۆزیت.. تۆ.

دایك: من؟

کوڕ: زۆر جار دەتبینم سەیری وێنەکەی ئەو دەکەیت.. هەندێ جاریش گوێم لێتە قسەی لەگەڵ دەکەیت یان قسە لەگەڵ خۆتدا دەکەیت.. بە تەواوەتی نازانم.. هەروەها *(دەوەستێت)*.

دایك: هەروەها چی؟ *(بە ئاسکییەوە)* بیڵێ.. قسە بکە کوڕم.

کوڕ: هەروەها دەگریت.

دایك: ئاە.

کوڕ: بۆچی دایە؟ وێنەکە دەتگرێنێ؟.

دایك: نەو.. بەڵام حەسرەتی ئەو کامەرانییەی ڕۆژێك لە ڕۆژان لە ژیانمدا هەروەکو خەون درەوشایەوە.. بەڵام.. هەر ئەوەندەی چاوترووکانێك چێژم لێ بینی..

کوڕ: کاتێك دەگریت ناتوانم تەماشات بکەم.. فرمێسك ڕوی مرۆڤ بێ ڕەنگ و چرچ و لۆچ دەکات.. وەکو ڕووی پیرەژنەکان.

دایك: فرمێسك خەم دەڕەوێنێ.

کوڕ: خەم مەخۆ.. دایە.. خەم مەخۆ.

دایك: هەوڵ دەدەم کوڕم.. ئیتر هەر ئەوەندە خەم هێرشی کردە سەرم هەوڵ دەدەم بە ڕووی ئەو کەسەدا ساردی بکەمەوە کە تەماشام دەکات.. ئەو کەسەی کە ژیانم.. لا شیرین دەکاتەوە.

کوڕ: وێنەکە.

دایك: نەو.. بەڵکو.. تۆ *(بە سۆزەوە لێی ڕادەمێنێت)*.

کوڕ: من..؟

دایك: ئەی خۆشەویستم جگە لە تۆ کێ دەتوانێ جێی ئەوم بۆ بگرێتەوە و لە بەردەممدا زیندووی بکاتەوە؟.

کوڕ: بەڵام.. حەیف.

دایك: حەیف.. بۆ؟

کوڕ: من وێنەی خۆم نیە.. تا پێشکەشی تۆ یان ئەوی بکەم..

دایك: خۆت هەیت.. ئەمەیان گرنگترە.

کوڕ: دایە.. بۆچی.. وێنەت نەگرتووم.

دایك: *(بە ئاسکی و سۆزەوە دەست بە دەموچاویدا دەهێنێ)* لەبەر ئەوەی پێویستت پێی نیە.. چونکە تۆ لەگەڵمدایت، من لە گەڵتدام و لەیەك جیانابینەوە.

کوڕ: ئەی ئەو.

دایك: ئەو؟ چیەتی..؟

کوڕ: داوای وێنەم لێ دەکات.. لەلای ئاوێنەکەوە هەڵیدەواسێت.. لە ژووری نووستن.. کاتێك من جێی دەهێڵم سەیری دەکات و لەگەڵیدا دەژی.

دایك: هەوڵ بدە جێی نەهێڵیت.

کوڕ: جێی دەهێڵم، دەبێ جێی بهێڵم... لەوانەیە زیاتر لەوەی چاوەڕێت دەکات.

دایك: بۆچی؟ چی وات لێ دەکات.. ئەوە بکەیت؟

کوڕ: لەبەر ئەوەی.. لەبەر ئەوەی من.. لەگەڵ تۆدا دەبم.. نامەوێ لێت جیاببمەوە.

دایك: لەم بارەدا دەتوانن هەردووکتان لەگەڵمابن.

کوڕ: نا.. من قایل نابم.

دایك: کەواتە من لە گەڵتاندا دەبم.

کوڕ: نا.. نا..

دایك: هەر نا؟ بۆچی..

کوڕ: دەترسم بەردەوام گیروگرفت و ناکۆکی لە نێوانتاندا ڕوو بدات، ئیتر ئەو کاتە من ون دەبم.. ئەوسا نازانم چۆن هەڵوێستی خۆم دیاری بکەم..

دایك: نا.. نا.. شتی وا ڕوو نادات.. دەتوانیت دڵنیابیت.

کوڕ: با ڕوو دەدات.. ئافرەت کە لەگەڵ خەسوویدا دەژی دەبێتە سەرچاوەی گیروگرفت.. لەسەر هیچ و پووچترین شت.. جا گەر بێتو ببێتە هۆی نیگەرانیت.. یان پەنجە بۆ تاڵێکی قژت بەرێت.. ئەوا منیش دەیکوژم.

دایك: *(بە ترسەوە)* ئۆه.. خوایە.

کوڕ: بۆیە.. چاکتر وایە ئەو بەجیا بژی و ئێمەش بە جیا.

دایك: بەڵام.. بەڵام.. چۆنت دەوێ با وابێت.

کوڕ: بەڵام ئەی وێنەکە.. وێنەکە.. ئەگەر من وێنەی خۆمی نەدەمێ ئەویش وێنەی خۆیم ناداتێ.

دایك: کە هات دەچین بۆ لای وێنەگرێك.. تا وێنەیەکی هەردووکتان بگرێت.

کوڕ: وەکو وێنەکەی تۆ لە گەڵ باوکمدا *(دایکی سەری ئەرێ دەجووڵێنێت)* نا.. نامەوێت.

دایك: ناتەوێت؟

کوڕ: بیرم لەوە کردۆتەوە.. وەکو دیاری وێنەیەکی خۆمی بدەمێ.. تەنها خۆم.. بۆ یادگاری.

دایك: لەم بارەدا دەتوانیت دیارییەکی تری پێشکەش بکەیت.. مادام تەنها بۆ یادگارییە.

کوڕ: دیارییەکی تر؟ چ دیارییەك باشە؟ هەر بە ڕاستی منیش بیر لە دیارییەکی تر دەکەمەوە.. بەڵام دەترسم شایستەی نەبێت.

دایك: هەموو دیارییەك شایستەیە.. مادام بەڵگەی سۆزەو پەیامی خۆشەویستیە.. ها.. بیرت لەچی کردەوە؟ پێم بڵێ..

کوڕ: لە.. لە.. *(لە ڕووی شەرمەوە بێدەنگ دەبێت)*

دایك: بیڵێ کوڕم.. بۆچی بێدەنگ بوویت.. بیڵێ.. بیرت لەچی.. کردەوە؟

کوڕ: لە چەپکێ.. گوڵ.

دایك: چەپکێ گوڵ؟.. ئەڵاه.. ناسکترین و جوانترین شتە بۆ دیاری.. ئای چەند وردبین و هەست جوانیت، ئابینا بێت ئەو کەسەی گومان لە ئەقڵت دەکات..

کوڕ: ئەقڵم.. ئەقڵم چیەتی؟

دایك: تەواوترین ئەقڵە لە جیهاندا.. دەتوانم لەلای خەڵك شانازی پێوە بکەم.. ها.. چ جۆرە گوڵێك هەڵدەبژێریت؟

کوڕ: نێرگز.. تۆ حەزت لە نێرگزە..

دایك: بەڵام تۆ بۆ ئەوی کۆدەکەیتەوە.. ڕەنگە حەزی لە نێرگز نەبێت.

کوڕ: حەزی لە نێرگز نەبێت؟.. تەڵاقی دەدەم.

دایك: تۆ دەڵێی چی.. کوڕم؟!!

کوڕ: دەبێ حەزی لێ بێت.. دەبێ حەزی لێ بێت.

دایك: باشە.. باشە.. حەزی لێ دەبێت.. بێگومان حەزی لێ دەبێت.

کوڕ: ئێستا.. ئێستا دەچم چەپکێکی گەورە کۆدەکەمەوە *(دەڕوات بۆ لای گوڵەکان)*.

دایك: ئێستا.. *(کوڕەکەی دەوەستێت)* ئەی.. ئەی.. بۆ جارێ وازی لێ ناهێنیت.. تا.. ئاوەکو ئەو دێت.

کوڕ: بۆچی؟!

دایك: هێشتا زووە.. دەترسم لە دەستتدا هەڵوەرێت.. یان بۆنەکەی بڕوات و جوانیەکەی نەمێنێت *(کوڕەکە بێدەنگە)* ها.. دەبینم بێدەنگ بوویت.

کوڕ: ڕاستە.. قسەکەی تۆ ڕاستە *(دوای ئاوێك.. لە پڕدا)* دایە.. چارەسەرەکەم دۆزیەوە.

دایك: چارەسەرەکەت دۆزیەوە؟ هەروا زوو.. ئادەی.. با بزانم.

کوڕ: هەردوو مشتم پڕ دەکەم لە ئاو.. تۆش گوڵەکانی.. تێدا دادەنێیت.

دایك: نابێت.. ئاوەکە لە درزی پەنجەکانتەوە دەڕژێت.. گوڵەکانیش تینویان دەبێت و دەمرن.

کوڕ: پەنجەکانم توند بە یەکەوە دەنووسێنم، درزی تێدا ناهێڵم.. ناهێڵم لە هیچ درزێکەوە ئاو بڕژێت.. ئاوەها.. سەیر کە.. دایە.. سەیر کە *(دایك لە هەردوو مشتی کوڕەکەی ڕادەمێنێ کە چۆن توند پەنجەکانی بە یەکەوە نووساندووە)*

دایك: *(بە سەرسوڕمانەوە)* جوانە.. جوانە..

کوڕ: *(بە کەفوکوڵەوە)* تاقی بکەرەوە دایە.. تاقی بکەرەوە.

دایك: تاقی بکەمەوە؟.. تاقی بکەمەوە؟.

کوڕ: ئاو لە جۆگەلەکە بهێنەو بیکەرە دەستمەوە.. بۆ ئەوەی خۆت ببینیت *(دایکە دوو دڵە)* دەی دایە.. دەی.. تکات لێ دەکەم.. جۆگەلەکە لە پشت کورسیەکەوەیە.. دەی.. تکات لێ دەکەم.

دایك: بەڵام.. بەڵام.. خەڵك چیمان پێ دەڵێن.. *(سەیری ئەملاولا دەکات؟ ئەوەی باشە هێشتا کات زووە.. کەس نەهاتووە (دەچێتە لای جۆگەلەکەوە) ئەگینا دەبووینە گاڵتەجاڕی.. (پێکەنینەکەی دەشارێتەوە) وەرە.. وەرە لە جۆگەلەکە نزیك.. بەرەوە (کوڕەکە نزیك دەبێتەوە، دایکەکە دەستی پڕ لە ئاو دەکات و دەیکاتە دەستی کوڕەکەوە، کوڕەکە بە خۆشیەوە پێ دەکەنێت، دایکیشی پێدەکەنێت)* چی دەتخاتە پێکەنین کوڕم؟

کوڕ: ئاوەکە دایە.. ئاوەکە.. ختووکەی لەپی دەستم دەدات.. ها ها ها.. هە هە هە.. تۆزێك ساردە.. بەڵام خۆشە زۆر خۆشە.. ها ها ها.. ها ها ها.

دایك: دڵشادبە خۆشەویستم.. چۆنت پێ خۆشە وا پێبکەنە.. (ئاوی زیادتر دەڕژێنێتە دەستیەوە).. ئای خوایە.. لە کەیەوە ئاوەها بە دڵخۆشی نەمبینویت، لە کەیەوە ئەم پێکەنینە ناسکەتم بەرگوێ نەکەوتووە.. بە قوربانت بم.. (دەنگی پێکەنینی هەردووکیان بەرز دەبێتەوە، دوو ئافرەت دێن، پێکەنینەکە دەیانوەستێنێت.. ڕووەو لای ئەوان دەچن، بەڵام دایك و کوڕ هەستیان پێ ناکەن)

ئافرەتی(1): چ پێکەنینێکە!.. دەڵێی دوو منداڵی ساوان.. تۆ بڵێی کامیان شێت بێت؟ *(پاشان)* ئای.. ئەوە خۆ نێرگز و کوڕەکەیەتی.. چی ئەمانی



گەڕاندۆتەوە بۆ ئێرە!..! ئەی ڕوون و ئاشکرا پێیان نەوتن کە هیچ سوودێکی نیە.

ئافرەتی(2): ئێرگز؟ ئاهـ.. چەند گۆڕاوە.. وەرە.. وەرە با سەلامی لێ بکەین و بزانین چی ڕوویداوە..

ئافرەتی(1): نا.. لێی نزیک مەبەرەوە *(دووەم بە سەرسوڕمانەوە سەیری دەکات)* ئافرەتێکی باش نیە.

ئافرەتی (2): بە پێچەوانەوە.. نموونەی ئافرەتی باش و بە وەفایە.. لەوەتەی مێردەکەی مردووە ئەم کارە دەکات و ڕەنج دەدات و.. ئابڕووی خۆی پاراستووە.. پاش مردنی مێردەکەشی بە وەفا بووە بۆی و بەرگەی تاڵی و سوێری ژیانیشی گرتووە؛ بە بێ ئەوەی گوێ بداتە هیچ شتێک.

ئافرەتی(1): وا ئەماوە.. دەڵێن هەمدیسان چووەتەوە بۆ.. بۆ..

ئافرەتی(2): بۆ.. بۆ.. *(ئیشارەت بۆ شوێنێکی نادیار دەکات.. یەکەم سەری دەلەقێنێ)* ئا.. ئەی بەسەزمان.. ئای کڵۆڵ.. پاش بیست ساڵ!! ناتوانم بڕوابکەم.. خوایە تۆبە.. ڕەنگە نەبوونی و.. دەست کورتی بێت.. ئەی بەسەزمان.. ئێرگز؟!!

ئافرەتی(1): بەڵکو شێتە.. ئەو خۆشەویستیە بێ سنوورەی کوڕەکەی وای لێ کردووە.. و ئازانێت چی بکات.. وەرە.. وەرە.. پێش ئەوەی بمانبینێت.. *(ڕوودو ساختومانەکە دەچن)*.

کوڕ: تنۆکێک ئاو چیە ناڕژێت.. دایە تاقە تنۆکێک.. ها ها ها.

دایک: جلەکانمان هەمووی تەڕبوون.. کەچی دەڵێی تنۆکێک نەڕژاوە.. ها ها ها.

کوڕ: ئاوی زۆرتر بهێنە دایە.. وا خەڵک بەرەو ئێرە دێن..

کوڕ: کەواتە دەچم گوڵ دەهێنم.

دایک: گوڵ؟ ئێستا..

کوڕ: بەڵێ مادام خەڵکی دێن، ئەویش دێت.

دایک: دەترسم قایل نەبن.. مەبەستم ئەوەیە نەهێڵن گوڵ لێ بکەیتەوە.

کوڕ: بۆچی؟.. من.. ناهێڵم ئازاریان پێ بگات.. بەوپەڕی.. وریایی و ناسکیەوە لێیان دەکەمەوە.

دایک: دەزانم.. دەزانم تۆ چەند ناسک و بەسۆزیت.. ئازاری هیچ بوونەوەرێک نادەیت.. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا.. دەبێ داوای یارمەتی لە خاوەن باخچەکە بکەین.

کوڕ: کەواتە با بچین و داوای لێ بکەین.

دایک: ئەو... ئەو.. جارێ نەهاتووە.

کوڕ: ئاهـ.. کچەکەی لای منیش هێشتا نەهاتووە.. خۆرئاوا دەبێت و هیچیان نایەن.

دایک: ئێستا خۆرهەڵهات.. ئەوەندە نابێت.. ئەو..

کوڕ: تۆزێکی تریش دوا دەکەوێت و.. دنیا تاریک دەبێت.. و لە ژێر باڵە ڕەشەکەیدا هەموو شتێک دەشارێتەوە.. دایە.. من لە تاریکی دەترسم.

دایک: تاریکی شتێک نیە خەڵک بترسێنێت!

کوڕ: ئەی ئەو تارماییانەی لە ناوجەرگەی تاریکیەوە دێنە دەرەوە؟

دایک: تارمایی؟!

کوڕ: نازانم.. ڕەنگە خەڵک بن.. بەڵام لە تاریکیەکەدا دەبنە تارمایی و چاویان گڕی لێ دەبارێت، وەکو چاوی پشیلە دەبریسکێتەوە.. بە چەقۆی درێژی تیژ کە تیشکی ئەستێرەکانی لێ دەدات لە ناو حەشاماتی خەڵکیدا ڕێگای خۆیان دەکەنەوە.. بەڵام ئەوەندەی پێ ناچێت.. کە چەقۆکان سک دەدڕن و تیشکی ئەستێرەکان نامێنێت.

دایک: تۆ باسی چی دەکەیت؟

کوڕ: ئەی دەنگە دەنگ.. دایە.. دەنگە دەنگ.. بە ڕاستی ترسناکە.. وەکو چۆن ئاوی دەریا دەوری ماسی دەدات ئاوەها دەورت دەتەنێت.. تاق تاق.. یا.. تاپ تاپ.. یا.. قژ قژ قژ.. جەرگەی ئاسمان دەبڕێت.. گوێ کەڕ دەکات.. ئینسان لە پێستی خۆیدا دەکوژێت..

دایک: تکات لێ دەکەم کوڕم.. تکات لێ دەکەم.. خەیاڵ لە شتی وەها مەکەرەوە کە بوونی نیە.

کوڕ: لە ڕۆژدا.. کاتێک خۆر هەیە، نیە.. بەڵام هەر کە خۆر ئاوا دەبێت.. لە تاریکیدا.. تاریکی شتێکی ئەگریسە.. ترسناکە.. دایە.. بابڕۆین.. بەر لەوەی بێت.. با بڕۆینەوەماڵەوە.

دایک: بەر لەوەی کێ بێت؟.. مەبەستت لە کێیە کوڕم؟؟

کوڕ: تاریکی.. تاریکی.

دایک: پێم وتیت ئەوەندە نابێ خۆر هەڵهاتووە.. ئەویش.. واتە تاریکی، زۆری ماوە.. لەبەر ئەوەی خۆر لەگەڵماندا زۆر دەمێنێتەوە.

کوڕ: *(لە خۆر ڕادەمێنێ)* من.. خۆرم خۆش دەوێت.. زۆرم خۆش دەوێت.. هەمیشە لەژێریدا هەست بە دڵنیایی و ئاسوودەیی دەکەم.. خۆزگە هەرگیز ئاوا نەدەبوو..؟ جێی بۆ تاریکی چۆڵ نەدەکرد.

دایک: تاریکی لەبیر خۆت بەرەوە کوڕم.. لە بیر خۆتی بەرەوە.. مادام ڕۆژ بە بەخشندەییەوە هەتاوی خۆیمان پێ دەبەخشێت، دەبا چێژ لەو گەرمی و.. ڕۆشناییەی وەربگرین.. بۆچی هەر لە ئێستاوە خۆمان بێ مراد بکەین.. تاریکی دوورە.. زۆر دوورە.. دوور.

کوڕ: بەڵام.

دایک: پاشان.. پاشان ئەوەت لە یاد نەچێت کە ئێمە لە گەڵیدا وادەمان هەیە.. جوان نیە بێت و نەتبینێت.

کوڕ: بەڵام کوانێ.. کەی دێت؟

دایک: دێت کوڕم.. دێت.

کوڕ: ئاهـ.. خۆزگە ئێستا دەهات.. وا خەریکە لە تامەزرۆیی بینینیدا دەسووتێم.

دایک: *(بە ئازارەوە)* ئاهـ.. من وا دەسووتێم.. *(وەک ئەوەی لەگەڵ یەکێک بدوێت)* من خەریکم دەبمە مشتێ خۆڵەمێش.. ئاهـ..

خوایە *(ئازار دەچێژێت، دەیەوێت لە کوڕەکەی بشارێتەوە)*.

کوڕ: دایە.. چیتە؟ ئازار دەچێژیت.. لە کەسێک دەچیت خەریک بێ بخنکێت.

دایک: نەو.. تکات لێ دەکەم نەو.. من ئەوەی دەیکەم و ئایکەم بۆ ئەوەیە تۆ ئازار نەچێژیت.. ئازار مەچێژە کوڕم.. ئازار مەچێژە.

کوڕ: ناتوانم دایە.. کە دەتبینم ئازار دەچێژیت من ناتوانم ئازار نەچێژم.

دایک: لە ئێستا بەدواوە ئازار ناچێژم.. بەڵێنت دەدەمێ لە مەودوا ئازار نەچێژم.

کوڕ: دایە با بڕۆین.. ئەو کچە ڕێزم ناگرێت.. منیش بەوە.. زۆر ئازار دەچێژم کە دەبینم ژنەکەم ڕێزم ناگرێت.

دایک: ئاخر ئەو ژنت نیە.. مەبەستم.. مەبەستم ئەوەیە جارێ نەبووە بە ژنت.

کوڕ: بەڵام دەبێت.. ئەی بۆ ئەوە نەهاتووین؟؟

دایک: ئێستا نا.. کتوپڕ لەم ساتەدا نا.. هێشتا زۆری ماوە تا ببێت بە ژنت.

کوڕ: با وابێت.. بەڵام دەبێ هەر لە ئێستاوە فێربێت ڕێزم بگرێت.. دایە.. تەڵاقی دەدەم.

دایک: تەڵاقی دەدەیت؟

کوڕ: ئەی پیاو کە تووڕە دەبێت وەها ناکات؟

دایک: جا تۆ تووڕەیت؟!

کوڕ: زۆر.

دایک: ئاهـ.. وەرە خۆشەویستەکەم.. وەرە.. سەرت بخەرە ناو کۆشمەوە.. تۆزێک بحەسێرەوە *(سەیری کاتژمێرەکەی دەستی دەکات)* دێت.. دێت *(دەست بە قژیدا دەهێنێت)*.

کوڕ: بۆچی دواکەوت، بۆ کوێ چووە؟ پێویستە بزانم.. دەبێ بزانم.

دایک: *(خەیاڵی ڕۆشتووە)* ڕۆیشت.. ڕۆیشت..

کوڕ: بۆ کوێ دایە.. بۆ کوێ؟

دایک: *(دەست بە قژیدا دەهێنێت)* قژی دەشوات.. شانەی دەکات و دایدەهێنێت.. کەی قژت شت؟

کوڕ: دوێنێ شەو.. تۆ بۆت شتم.

دایک: بۆنی خۆشە.. ئای کە بۆنی خۆشە..؟

کوڕ: قژی.. درێژە؟

دایک: زۆر نا.. پاکە.. داهێنراوە.. نەرم و شلە..

کوڕ: دەبێ بیبڕێت..

دایک: بۆچی؟ *(پەنجەکانی لە قژە زۆرەکەیدا ون دەکات)*

کوڕ: حەزم لە قژی درێژ نیە..

دایک: پێی ڕادێیت.. ڕادێیت.. وات لێ دێ ناتوانیت لێی جیاببیتەوە.

کوڕ: بڕوا.. ناکەم.. چونکە من *(دەست بە قژی دایکیدا دەهێنێ)* حەزم لە قژی کورتە.

دایک: *(وەک ئەوەی لە خەوندا بێت)* ک.. و.. رت.. بۆچی کورت؟

کوڕ: وەکو قژی تۆ.

دایک: قژی من.. چیەتی؟

کوڕ: جوانە.. ناسکە.. حەزم لێیەتی.

دایک: *(ڕادەپەڕێت)* نەو.. دەسکاری قژم مەکە *(لە خۆی دوور دەخاتەوە)*.

کوڕ: دایە.. من.. من.. *(پەنجەکانی دایکی دەگرێت)*.

دایک: *(بە هەڵچوونەوە دەستی خۆی ڕادەکێشێتەوە)* هیچ شوێنێکم.. دەستم لێوەمەدە.

کوڕ: دایە.. تووڕە مەبە.. تکات لێ دەکەم.. دایە..

دایک: *(بە دەست هەندێ هەست و ئەستی ناوەوەیەوە ئازار دەچێژێت)* ئاهـ.. خوایە..

کوڕ: ڕقت لێم نەبێت دایە.. تکات لێ دەکەم.. ڕقت لێم نەبێت.

دایک: ئاهـ.. ئاهـ..

کوڕ: ڕقت لێم بێت... خۆم دەکوژم.

دایک: کوڕم.



کور: ئەگینا لە تاریکیدا دەچمە دەرەوە.. لە بەرچاوی پشیلەکاندا خۆم دەخەمە بەر چەقۆکان تا ورگم بدڕن.. و.. ئەوسا.. منیش وەکو باوکم.. ئیتر هەرگیز ناگەڕێمەوە بۆ لات.

دایك: تۆ.. تۆ خۆشت نازانیت دەڵێی چی.. نازانیت چی دەکەیت ئاه.. منداڵیت.. منداڵێکیت و هیچی تر.. تاکەی وا.. بە منداڵی دەمێنیتەوە.. تاکەی.. ئاخ.. خوایە..

کور: تا ئەو کاتەی تۆ دەتەوێت دایە.. تا ئەو کاتەی تۆ دەتەوێت.

دایك: ئاخ.. خوایە.. بڕۆ کوڕم.. *(بە نەرمییەوە لە کوڕەکەی دوور دەکەوێتەوە)*

کور: بۆ کوێ بڕۆم دایە.. بۆ کوێ؟

دایك: بۆ.. بۆ.. نەتدەویست گوڵ لێ بکەیتەوە؟

کور: ئێستا؟ *(سەری ئەرێیی بۆ دەلەقێنێ)* چ جۆرێك هەڵبژێرم؟

دایك: حەزت لە هەر جۆرێکە.

کور: نێرگز.. ئەو جۆرەی منی خۆش دەوێت.

دایك: باشە.. باشە.. تۆ بڕۆ! *(کوڕەکە بە ئرکان.. دەڕوات)* برۆ و بهێڵە هەناسەیەك بدەم و تۆزێ خۆم کۆبکەمەوە.. ئاه.. خوایە چاوت لە من و لەوەوە بێت *(دەشڵەژێت، ماندەستێتە سەرێ، بە پەشۆکاوییەوە بە دوایدا دەگەڕێت)* دوور نەکەویتەوە.. لە شەقامەکە نزیك نەبیتەوە.

دەنگی کوڕەکە: لێرە.. دایە.. لێرە.. ئەم.. گردە نزیکە هەمووی نێرگزە *(سێ پیاو لە ساختومانەکەوە دێن، لە لای ئافرەتەکەوە دەوەستن)*.

یەکێکیان: خانم.. هاتووین بۆ..؟

دایك: *(بە کوڵەوە)* لەوێیە.. ئەوەتا.. خەریکی چنینەوەی گوڵە.

پیاوەکە: گوڵ؟ بۆ کێ..؟

دایك: بۆ خۆی.. بۆ من.. بۆ ئێوە.. نازانم.. نازانم، ببیەن.. ببیەن و ئیتر بەس ئازارم بدەن.

پیاوەکە: *(بە سەرسوڕمانەوە)* ئازارت بدەین؟ ئەی تۆ.. نەتویست کە..

دایك: بەڵێ.. بەڵێ.. ئاه.. خوایە.. بەڵام بە هێمنی لە گەڵیدا بجوڵێنەوە.. تکاتان لێ دەکەم.. مەهێڵن خەم بخوات تکاتان لێ دەکەم..

پیاو: *(ئیشارەت بۆ دووانەکە دەکات، بۆ لای کوڕەکە دەچن)* دڵت هیچ نەکات خانم.. ئێمە ئەرکی خۆمان باش دەزانین.. تەنانەت ئێمە جلوبەرگە تایبەتیەکانی خۆشمان لەبەر نەکردووە.

دایك: هیوادارم.. وابێت *(دەنگی پچڕ پچڕ دەبێت)* هیو..ا.. دا.. رم.. وا بێت.

پیاو: *(بە پەشێوییەوە)* خانم.. تۆ سەلامەتیت.. هیچت نیە؟

دایك: گرنگ ئەوە سەلامەت بێت.. ئەو هیچی نەبێت.. گرنگ ئەوە.. ئەو *(جانتای جلوبەرگەکان لە ژێر کورسیەکە دەردەهێنێ و دەیداتێ)*

پیاو: ئەمە چیە؟

دایك: جلوبەرگەو.. هەروەها هەندێ خواردنیشی تێدایە حەزی لێیانە.. تکات لێ دەکەم.. ئەگەر تەنها بۆ ئەم ڕۆژانەی سەرەتاشی بووە.. تاوەکو بە شوێنەکەو..



بە ئەوو.. بە ئێوەش ڕادێت.. تکات لێ دەکەم.. *(پیاوەکە خێرا لێی وەردەگرێت)* شۆو.. سوپاسی دڵباشیت دەکەم.. زۆر سوپاس *(هاوارێکی بەرز لە کوڕەکەوە دێ.. دایکە ڕادەپەڕێت)* ئاه.. خوایە ئەوە چیە!! چی ی لێ دەکەن؟ *(هاوار لە دوو پیاوەکە دەکات)* نا.. نا.. تکایە ئاوەها نا.. برایان.. ئاه.. *(دەستی کابرا دەگرێت ماچی بکات)* تکات لێ دەکەم.. بەڕێز لێت دەپاڕێمەوە.. دەستەکانت ماچ دەکەم.. پێیان بڵێ بە نەرمی لەگەڵیدا هەڵسوکەوت بکەن.. ئازاری نەدەن.

پیاوەکە: *(بە دوو پیاوەکە)* لە سەرخۆتان.. لەسەرخۆ بن لەگەڵیدا.. گوێ ڕایەڵە.. ئازاری کەس نادات.

دایك: کوڕەکەم.. ئاسکە.

پیاوەکە: دەزانم خانم.. دەزانم.. منیش ڕەچاوی هەڵوێستت دەکەم.. دڵنیابە خانم.. دڵنیابە.. بە دڵی تۆ دەبێت. *(دوو پیاوەکە کوڕەکە دەهێنن، کە لەملا و لاوە گرتویانە.. بەڵام بە ڕەقییەوە نا)*.

کور: *(دەیەوێ ڕووەو دایکی دەربچێت و هەوڵ دەدات خۆی لە دووانەکە ڕزگار بکات؛ بەڵام توند گرتوویانە بۆیە ناتوانێت)* دایە.. نەیانهێشت گوڵەکان بچنمەوە.. هەر ئەم چەپکە بچکۆلەیەم چنیەوە.

دایك: *(بە دەنگێکی گریاناوییەوە)* قەیناکا.. کوڕم..

کور: ئەمانە چیان لێم دەوێ.. دەستم لە گوڵی باخچەکەی ئەمان نەداوە.. لە گردەکە چنیمەوە.. لە دەرەوەی باخچەکە.. هەمووی نێرگزە.. سەیر بکە.. هەمووی نێرگزە.

دایك: *(ئازار دەچێژێت)* ئاه.. ئاه..

کور: بەڵام.. بەڵام.. چیان لێمان دەوێت *(دایکەکە بە هێمنی دەگری)* ئاه.. دایە.. تۆ دەگریت.. دایە.. ئاه.. بەرم بدەن، بەرم بدەن ئاه.. چیتان لە دایکم کردووە؟.. دایە..؟

پیاو: *(بە دوو پیاوەکە)* دەی خێراکەن.. مەهێڵن ئافرەتەکە لەوە زیاتر ئازار بچێژێت *(دوو پیاوەکە ڕایدەکێشن)*.

کور: *(چمکی کراسەکەی دایکی دەگرێ)* ئاه.. نا.. دایە.. مەهێڵە بمبەن.. دایە *(گوڵەکانی لێ دەکەوێت)* گوڵەکان.. دایە.. گوڵەکان.. نێرگزەکە.. نا.. پێی پێدا مەنێن *(دایکەکە دادەنەوێتەوەو گوڵەکان کۆدەکاتەوە)*) ئاه.. دایە.. بە بێ تۆ چیم بەسەر دێت.. بە بێ من چیت بەسەر دێت.. دایە.. *(ڕووەو ساختومانەکە دەیبەن، بەر لەوەی لە چاو ون بێت هاوار دەکات)* دایە..

دایك: *(لە جێگای خۆیدا جام دەبێت.. چاوەکانی لە جێیەك گیردەبن)* ئاه خوایە.. چیم بەسەر دێت.. چیم بەسەر دێت؟! *(بە هەنسکەوە گوڵەکان بە سنگیەوە دەنووسێنێت)*

ئەم شانۆنامەیە

ئەم کتێبەوە وەرگێڕاوە– (مساء السلامة ایها الزنوج البیض –مسرحیات) تالیف: محی الدین زەنگەنە.. من مطبوعات الامانة العامة للثقافة والشباب–1985.

**لیكۆڵینەوە**

# محــێدین زەنگنە لـە نێوان هەردوو شـــانۆی عەرەبی و کوردییدا

عەلی کەریم

لەساڵی 1969 بۆیەكـەمین جـار لـە شـانۆییەكی عەرەبی بەشداریم كردو، هەر لەوێشەوە خۆشەویستیم بۆ شانۆ چەكەرەی كرد، كەخەڵكی شانۆكاریشم ناسی، ناوی (محی الدین زەنگنەم) بەر گوێ كەوت، هەوڵم دا شتێكی بخوێنمەوە بەردەستم نەكەوت دواتر رۆمانی ئاسۆسم بەسێ سەعات و بەیەك كەرەت خوێندەوە، لـەوێوە لـە (محی الدین زەنگنـە)و بـیرو بۆچوونـی محی الدین زەنگنە گەیشتم،منیش وەك كوردێك و رۆژهەڵاتی‌یەك كەخێرا سۆز ئەبەخشـی‌و، زۆر زووش هەڵئـەچێت مامۆستا زەنگنەم خۆشویست.

یەكـەمیان: وەك شـانۆ نوسـێك چونكە خۆیشم شانۆ كاربووم‌و،

دووەمیـان:كـە زەنگنەیـە چونكـە خۆیشـم زەنگنـەم، پاشـان لەبـەغداو، لەیەكەمین ڤێستڤاڵی هونـەری كـوردی لەگەڵ شاعیر شێركۆ بێكەس لـەهۆڵی (خولـد) بینیـم، ئەوسـا منیـش بـۆ ڤێستڤاڵەكە خـۆم ئامـادەكردبوو،بیرمە لەدەرەوەی هۆڵەكـە لێیـان پرسیم ئـەو بابەتـەی شـانۆیی (تەقینـەوەم) لێـوە ئامادەكردوە چی‌یە؟ ئەمنەزانی چییان پێ بڵێم چونكە نوسینی ئەو شانۆییە لەژێر كاریگەری (تازە تێگەیشتنی) من بـوو بـۆ ماركسـی‌یەت‌و، لەئـەنجامی دیـالۆگی بـەردەوامی مـن‌و، سـەلمان كاكـەیی‌و جـهاد دڵپـاك‌و، فـەرەیدون عبدالقـادرو، شـەهید ئـەنوەر زۆراب كەئـەو دەمـە (فكـری ماركسـیزم) پانتاییـەكی زۆری بیركردنـەوەمانی داگـیركردبوو. كەلـەدوای نسـكۆی شۆڕشـی ئـەیلولیش گەڕاینـەوە ناوشار هونەرمەند جەلیل زەنگنە لەسلێمانی شانۆیی (ئـهێنی)مامۆستا (محێدیـن زەنگنـە)ی بەرهـەم هێنـا، بێگومـان بۆ یەكەمین جـار بەرهـەمی‌محێدین زەنگنـە لەكوردستان نمایش بكرێ دوابەدوای ئەوەش نمایشی (مۆڵەتم) لەسەر شانۆ بینی كەلەدەرهێنانی هونەرمەند ئەحمەد سالارو، نواندنی ئەكتەرەكانی تیپی پێشڕەوی شـانۆی كـوردی بـوو، ئـەم دوو نمایشـە كاریگـەری خۆی‌لەسـەر ناسینی (محێدیـن زەنگنـە) لەناوخـەڵكی شانۆ دۆست هەبوو، راستە زوتر وەك ناوێك ئەناسرا بەڵام بەم شانۆیی‌یە زیاتر خەڵكی شار ئاشنای بوون‌و، بەبینینی ئەم دوو بەرهەمە زیاتر لێی گەیشتن.

هەموو شانۆنامەكانی (محێدین زەنگنـە) بـەزمانی عەرەبی نوسراون‌و ئەهمیەتی خۆیشیان هەیە لـەلای شانۆكارانی عەرەب‌و عێراق، روداو لـە شـانۆییەكانی (محێدین زەنگنە) بەهۆی تۆكمە دارِشتنی بابەتەكەو، زمانـە شـیعری یەكـەی‌و، بزاوتـی بـەردەوامی كارەكتـەرەكان هەمیشـە لەگەشـە كردندایـەو دیمـەن بەدیمـەن روداوەكـان ولایەنـەكانی ململانێكـە گەشـەئەكات‌و، یـەك لانەبێتـەوە، لەبەرئـەوەی لەشانۆیی‌یەكانی (محێدین زەنگنە) كارەكتەر هەڵگری پـەیامێكی فكری‌یەكـە نووسـەر مەبەستی‌یەتی لـەو رێگایەوە هەم روداوەكان‌و شێوازی روداوەكان بخاتە روو، هەمیشە مەبەستی‌یەتی لەمیانەی روداوەكانـەوە كارەكتـەرەكانی كەهـەڵگری پـەیامن‌و زۆرجـار تایبەتمەندێتی خۆیـان وەكـو مرۆڤـی تـاك لەدەسـت ئـەدەن بناسێنن بەبینەر كەئەم مرۆڤانـە (نمونـەیین)و



هەریـەو ئاراسـتەیەش ئاراسـتەكراوون كەپایەمـە فیكری‌یەكەی نووسەر بگەیێنن.

ئـەوەش كـاریكی ئاسـایی‌یە بـۆ نوسـەریكی وەك مامۆستا (محیدین زەنگنە) چونكە نورسەر هەرلەتاقی لاویتی‌یەوە هۆگری بیروبۆچونیكی ئاشكراو، رونەو، هەولیشـی داوە لەرێگـەی شـانۆوە كیشـە گرنگـەكانی گەلەكـەی‌و، بەتایبـەتی چـین‌و تویـژە سـتەمدیدەكان بكاتە بابەتی سـەرەكی بەرهەمـە شـانۆییەكانی‌و، لـەم دەروازەشـەوە سـپی لـەرەش‌و، چـاك لـەخراپ، هـەق لەناهـەق جیـا بكاتـەوە، ئـەم ئوسـلوبەش لەشـانۆی عیراقی‌دا باوەو، تارادەیەك ئاسنامەیەكی بۆخۆی پیك هیناوە، بەڵام ئەشبیت ئەوە بلین كە نوسەری شانۆیی بـەناوبانگی عـیراق (محیدیـن زەنگنـە)لـەكۆتایی هەشـتاكانەوە هـەولی داوە بەئاراسـتەیەكی دی هـەنگاوبنی ئـەویش بەسـوود وەرگرتـن لەبابەتـە مێژوویـی‌و مەلحەمی‌یـە كوردیـەكان بـەڵام بەشێوازیكی‌هاوچەرخانەو دوور لەتەمتومان‌و ئەزۆكی زمان،چونكـە زمـان بـەلای نووسـەرەوە توخمـی هـەرە گرنگـی گوزارشـت كـردن‌و ئاشـكراكردنی لایەنـە خەفەكراوەكانی كارەكتەرو، تیكرای روداوەكانە، لەلای نووسـەر كەوتنـە دوی رووداوو،بەبەرهـەم هینـانی (مانا)تاك مەوداكانی‌و، لەچوارچیوەی گرتنی پەیامە فكری‌یەكەی خۆی لەرێگەی كارەكتەرەكانەوە دوكردەی گوزارشـت ئـامیزن‌و، بـەو ئاراسـتەیەش بەرجەسـتە ئەكرین.

لەهەردوو شانۆیی الصدیقان (دووهاوری)و، تكلم یا حجر (بەردەكە قسە بكە) كە یەكەمیان لـەدەرهیتانی سامی عبدالحمیدو، ودووەمیشیان عبدالقادر العانی بوو، پالەوانی ئەم دوو شانۆیی‌یە هەلگری پەیامیكن‌و، دەرهاویشـتەی ئاسـەواری روداویكـن كەلـەوەو بەرروبداوەو ئەنجامەكانی كاریگەرییان هەیە بەسەر دەرهاویشـتە فكـری‌و ئەخلاقی‌یەكانی‌یـەوە. كـە هـەرگیز نـاتوانیت‌و لـەتوانایدا نی‌یـە سسـتمیك لەئامارژەی (مانا) هەلگر بەبەرهەم بهینی، لەنمایشی (صراخ الصمت الاخرس) كەلە دەهینانی‌د. عەونی كـەرومی بـوو حالەتـە ئینسـانی‌یەكانی هـەردوو پالەوانەكـە هـەنگاو هـەنگاو، لەرێگـەی زمـانیكی شانۆیی‌یەوە گەشەی ئەكردو، رووەو لوتكـەی ئـامۆ بوون‌و قورسی دەسەڵاتی دەرەوە بۆ سەرتاك پەرەی ئەسـەند، ئـەم شـانۆیی‌یەدەنگ‌و سـەدای هـەبوو، زۆریشی لەسەر وتراوبە كـاریكی جددی (محیدیـن زەنگنە)دائەنریت.

كارەكتەرەكانی (محیدین زەنگنە) خەسلەت هەلگرن، نـەك (نـاخ) هـەلگر، بۆیـە ئـەبینین لەزۆریـەی شانۆییەكانی (كارەكتەر) بەیەك ئاراستەی ئەخلاقی پەیام هەلگر كە گوزارشت لەچینیك، یـان تویژیـك، یـان فكریكـی دیـاریكراو ئـەبات، بـەواتا كەسایەتی‌یەكانی (زەنگنە) لەكیشە ئینسـانی‌یەكان وەك (تاك)و،بەدەر لە(كۆمەل) ئاخریتـە روو، بـەلكو وەك خەسلەتی فكری‌و ئەخلاقی‌و نمونەیی رەفتارو هەلسوكەوت ئەكـەن، بەمەبەستی بوونـە (رەمـزو)، پالـەوان چونكـە كەسـایەتی پـەیام هـەلگردەبی بەنمونـەو، شـوین پی‌ی‌هەلئـەگیری‌و،چـاوی لی ئەكریت.

ئەوەی جیگای مشت‌و مرو لیدوانە تائیستا شانۆی كوردی هەولی نەداوەو،نەشیتوانیوە سوود لەئەزمونی نووسـینی شـانۆیی(محیدیـن زەنگنـە) وەربگریـت‌و پرسیارەكەش ئەمەیە؟

ئایـا شـانۆكاری كـورد بەرهەمـەكانی (محیدیـن زەنگەنـە)ی رەتكردۆتـەوەو خسـتویەتیە ئەرشـیفی لەبیرچونـەوە، یـان كالفامی‌یـەك هەیـە لەتیگەیشـتنی نوسینەكانی محیدین زەنگنە؟

ئەگـەر مەسـەلەكە رەتكردنـەوەی ئەو جـۆرە دەقانـە بـی كەگوایـە لەگـەل ئـەمرۆی شـانۆی ئەزمونگـەری‌و، نویخوازیـدا نـاگونجی، ئـەی بـۆ ئـەدەبی شـانۆیی (محیدیـن زەنگنـە) لـەلای عەرەبـەكان رەواجـی هەیـەو ئەهمیەتی خۆی دراوەتی؟!.

ووتار

# محیّدین زەنگنە و دایـــکی گۆرکی

گێڕانـەوەی ڕووداوی نزیکـەی نیوسـەدە بـەر لەئێستا وەکـو خـۆی رەنگـە کـارێکی سـانا نـەبێ بـەلکووردبینی و ئێسـتی ئـەوێ تـا بەنامانەتـەوە حالەتەکـە بگەیەنێتـە خوێنـەر، یـەکێك لـەو بیرەوەریانـەی مـن لەگـەڵ مـامم (محیّدیـن زەنگنـە) کەئەمەوێ خوێنەری لێ ئاگادار بکەم ئەوەیە: ئەو کاتە ئێمە لەگەڕەکی (شاترلو)ی کەرکوك پێکەوە ئەژیاین، ئەو منی کردە خوێندکارو لەقوتابخانە ناو نووسـی کـردم، لەبەرئـەوەی هەمیشـە چـاودێرێکی زۆر وردی پـەروەردەو هـەڵس و کـەوتمان بـوو ئەگـەرچی لـەڕوی تەمەنەوە لەباوکم و مامەکانی ترمان منداڵ تربوو بەم بەلام لە هەموویان زیاتر سلّمان لێ دەکردەوە..

لەیادمە جاریکیان زللەیەکی لێ دام لەسـەر ئەوەی بەوردەگـەچ لەسـەر دیوارەکـەی ئەوبەریانـەوە ئـەو شتانەم دەنووسـی کەلەقوتابخانە فیرکرابووم، وتـی: بەدەست یا بەتەباشیر بنووسە.

رۆژێکـی سـالی 1957 لەقوتابخانـە گەرامـەوە بینیـم بـەردەم مالـەوەمان زۆر قەرەبالغـەو هـەموو ئەگریان، ئەنکم بەدەم لەخۆدانەوە ئەیگووت: چەندم ووت پیاوت بکوشتایەو ئەمەت نەکردایە.. ئیتر لـەو ژاوە ژاوەدا دایکم بینی ووتی: هەرئیسـتا بـرۆ خـۆت بگەیەنە باوکت و ئاگاداری بکەوە (کاك محیدین) یان گرتووە یا مشوریکی بخوا، راکە برۆ مەوەستە.

ئـەوکات بـاوکم لـە بەریوەبەرایـەتی (مصـرف الرهون)بوو، وەزعەکـەم تیگـەیاندوو پیکەوەچووینـە لای بەریوەبەرەکەی، ئەویش دوای ئـەوەی بەتەلەفۆن شوینی پەیوەندیداری ئاگادار کردەوە، تەلەفۆنەکەی داخستەوەو باوکی ئاگادارکردەوە کەلەسـەر کتیبـی (دایك)ی ماکسیم گۆرگی-بەندکراوەو چەند کتیبیکی تـری (ریـش پانـەکانیان) لەکتیبخانەکـەیدا گرتـووە. ئەوجا ووتی: بەهەرحال من هەولم بۆ داوە، تۆبرۆرەوە.

کەلە(قۆریەوە) گەراینەوە بۆ (شاترلو) بەردەم مالی باپیرەمـان هیمـن بـوو ئیـتر لـەویوە زانیمـان (کاکـە محیدین) بەربووە.

کەچواردەی گـەلاویژ هـات و رژێمـی پاشـایەتی روخاوکۆمار دامـەزرا، بـە بیرکردنـەوەی ئـەو سـەردەمە هەندی لەکەسوکار بـۆ گـەنجیتی (شافەیسـەل) بـەداخ بـوون، بـەلام کـاك محیدیـن لایـەنی باشـی دەسـەلاتی کۆماری و روی دواکەوتویی رژیمـی پاشایەتی بۆ روون کردنەوەو جیاوازی شیوەی دەسەلات و سودی بۆ گـەل لای هەموان خستە روو.

دوای چـەند مـانگیك لەقوتابخانـەوە هـەموویان ریزکردیـن بـەرەو (سینەما خـەیام) ئـەوناوە ئـەوەندە قەرەبالغ بوو وەك بلیی : (دەرزیـت هەلدایە سەر زەوی نەدەکەوت) دواتر یەکیك لەمامۆسـتاکان هاتـە لامـەوە ووتـی: دنیایـەکی سـەیرە هـەتا دوینـی ئـەم فیلمـە کتیبەکەشمان قەدەغەبوو کەچی ئەوەتا ئیستا بۆ ئیمە نمـایش دەکـری؛ ئەمـە فیلمـی (دایـك)ی ماکسـیم گۆرکییە



دواتـر کـاك محیدیـن زەنگنـە) بـۆ خوینـدن چـووە زانکۆی موسل تەنیا هاوینـان دەمانبینی، ئایشارمەوە کەئـەو لەکـەرکوك نـەدەبوو ئیمـە زۆر ناسـودەبووین چونکـە کەسـیك نـەبوو وەکـو ئـەو سنور بـۆ نـاژاوەو عەجولی ئەوکاتەی تەمەنمان دابنی..

ئەوەبوو رۆژگارهات و (محیدین زەنگەنە) بووە ئەو نووسـەرەی کـە ئیسـتا هـەموومان دەیناسـین و کتیبـی (کوللـە)ی ئـەویش مارەیـەك قەدەغـەکراو بەهەرکـەس بگیرایە بەدەردەکەی ئەو جارەی خۆی دەچوو.

ئەوەی خۆش بەختی و ئاسودەییە بـۆ مـن توانیـم سالی 1976 شانۆگەری (نهینی) ئەو نووسەرە بکەمە کوردی و بۆ نمایشی سەر شانۆش کاری دەرهینـانی تیا بکەم.

**جەلیل زەنگنە**

چیرۆك

# خەونێکی پەرت بەدوای کەسێکدا دەگەڕێ بیبینێ

**( هەوڵی سازدانی خەونێك )**

**و: شاهۆ سەعید**

خۆم دۆزییەوە، دوای ونبوونو هەناسەبڕکێو تەنگەنەفەسییەکی زۆر، بەترسێکی زۆرەوە، لەسەر گردێك خۆم دۆزییەوە، ترسێك نەنگێزەکەی نازانم، بێهودە هەوڵدەدەم پاساوێکی بۆ بدۆزمەوە، کە دڵنیام بکاتەوەو رازیم بکا، راستە گردەکە بەرزو گەورەیە، بەشێوەیەك دێتە بەرچاوم کەوردە وردە بەرزترو گەورەتر دەبێ، تا خەریکە دەبێتە کێوێکی بەرزو ترسناك بە ئاسمانێکی هیلامیدا هەڵچووە، تەمتومان، یا شتێك وەك تەم دێتە بەرچاوم لێی ئالاوە، تەمێکی چڕو تاریك کە لەسەر چەرمە لینجەکەی چەند خاڵێك دەبریسکێنەوە. جار بەجار پڕیسك دەهاون، وەك چەند خۆرێکی ئاگرین،بچوك، زۆر بچوك.. وەك چەند پشکۆیەکی گەش کە پارچەی بچوکتری لێدەبێتەوە.. لەگەڵ هەموو چاو هەڵهێنانێکدا دەچنە چاومەوە.. بۆیە بەپێی توانا چاوی خۆمیان لێدەپارێزم.. بەڵام ئەو خۆپاراستنە تەنها چەند چرکەیەك دەخایەنێ، چونکە بەرامبەر ئەو هێزو جەبەروتە خۆم پێناگیرێو تەسلیمی فزولێکی سەیر دەبم، توانای بەرگری لەدەست دەدەمو، ئاو بەناو چاو دەکەمەوە، گردەکە دەبینم کە سەراپا پوشو پەلاش دایپۆشیوەو، خەریکە منیش غەرقی ئەو پوشو پەلاشە دەبم.. لە کاتی رۆشتنمدا لەژێر قاچمدا دەشکێنو ورد دەبن.. لەکاتێ تێکشکانیاندا دەنگێکی تاساویان لێدێ، وەك ئوزەی بونەوەرێك لەسەرەمەرگدا بێ‌و، بەشێوەیەك توشی بێهیوایی بووبێتو، بەشێوەیەك پەلاقاژە بۆ ژیان بکا. دادی بۆ من هێنابێت.. منیش بەشێوەیەك تۆقیومو دەسەوسان وەستاوم، کە کتوپڕ ئەو هەستەم لادروست دەبێ کە توانام نییە تەنانەت بەکەڵکی خودی خۆشم بێم. بەسەر پوشو پەلاشەکاندا باز هەڵدەدەم، ئارەزوویەکی خورافیم لا دروست دەبێ ببمە خاوەن هێزێکی سیحریی و دوو باڵەم لێبڕوێ، بەسەر ئەو بونەوەرە نەگبەتو بێدەرەتانانەدا بفڕم، تا بە قاچ پانیان نەکەمەوە. یا بەکردەی بکەر، مەبەستم قودرەتی قادرە، هێندە تەنك ببمەوە ببم بە (با)، بایەك تەنانەت گەر بە پەناشیاندا تێپەڕێو، لێشیان بنالێ، هێندە ئاسك بێت هەستی پێنەکەن، بەڵام ئەم ئارەزووە چۆن جێبەجێ دەبێ؟ قودرەتی ئەو قادرە کەی دێتو، بەزەیی بۆ حاڵم دەجوڵێو، لە دۆزخێکەوە دەمخاتە دۆزخێکی تر؟

لەناکاو .. پێشهاتی لەناکاویش زۆرە، هەندێ جاریش زۆر سەختە، بەتایبەتی لە جیهانێکدا کە ئەقڵو لۆژیکی تیا نەبێت یا لەکار کەوتبێ. بە پێچەوانەی پاساکانی زانستو مەعریفەوە ئەو خاکەی پوشو پەلاش دایپۆشیوە دەبێ بە جەنگەڵێکی چڕ لەدڕكو داڵ.. تا چاو بڕکا دیمەنی ئەو تۆپە دڕکاویانەم بەرچاو دەکەوێ کە لەسەر لقە بەرزو لاوازەکانن.. ئەو تۆپانەی کە پۆشاکێکی سەوزو دڕکاوی دایپۆشیون، خەت خەتی وەنەوشەییان لەسەرە. ئارەزوویەکی شێتانە گرتومی بۆ ئەوەی شەق هەڵدەم لە یەکێك لەو تۆپانە.. کەشەقیشم دەوەشێنم، لەناکاو دەیان نینۆکی شەیتانی کە خۆیان حەشار داوە، وەك چەقۆی تیژ، لە قاچە رووتەکانم دەچەقێن.. منیش لەتاو ئەو ئازارەی کە بەهەموو گیانمدا بڵاو دەبێتەوە، هاوار دەکەم بێئەوەی دەنگم دەرچێ. چاوەڕێم لەتاو هاوارەکەم گەردوون درزی تێببێ کەچی هاوارەکە وەك دەنگێکی نوساوی بێمانا دەگەڕێتەوە ناو قوڕگم.. هەستێکم لا دروست دەبێ، کە نازانم لەکوێوە سەرچاوەی گرتووە، هەستێك بەوەی خەون دەبینم، هەموو ئەو دیمەنانەش هیچ نەبووە جگە لە خەونێکی ناخۆش کە هێندە نابا تەواو دەبێتو خۆمی لێدەرباز دەکەم ئازارەکانم تێدەپەڕێنمو، بەسەر ئەو قاچەمدا ئەنوشتێمەوە کە دڕکێکی بێشومار شەقار شەقاری کردووە. هەوڵم دا هێز بخەمە سەر قاچەکەی ترم کە ساغ بوو.. کەچی هاوسەنگی جەستەم تێکچوو و کەوتمە سەر ئەو خاکەی کەبە دڕكو کاگوڵو سوێڕو دەرزیو دەبوسو چەقۆی تیژو هەموو چڕنوکە شەیتانیەکانی تر.. داپۆشرابوو هەموو بەشێك لە بەشەکانی جەستەم هاوار دەکاو دەناڵێنێ.. وشکە شەپۆلێکی سەخت دامدەگرێ..ڕۆدەچێتە نێو دەمارەکانم.. هەست بە تینوێتییەکی زۆر دەکەم.. قوڕگم وشك هاڵاتووەو شەقار بووە، لەگەڵیدا دەنگو هاوارم تاساوە.. بەو هیوایەی دڵۆپە ئاوێکم چنگ کەوێ قوڕگمی پێتەڕبکەم.. دەست درێژ دەکەم بۆ ریشاڵە وەنەوشەییەکە تا ئەو خڕنورکەم چنگ کەوێ کە ڕەنگە سەوزەکەی ئاوی چاومی بردووە، دوور لەو نوکە دەرزییانەی کە پێستەکەمی کون کون



کردووه.

لەگەڵ یەکەم پاروو جویندا دەمم پڕ دەبێ لەتاڵییەکی سەیر.. هەستدەکەم تەنانەت دەریایەکیش لەژەهر ئەو تاڵییە ناخۆشەی تێدا نیە.. تفی دەکەمەوە

هەست بە سوتانەوەی ناخم دەکەم خوێنێکی رەش دەهێنمەوە کە چەند وردە شتێکی رەشی تێدایە وەك ئەوەی بەشێك بێت لەجگەرمو پەرت پەرت بووبێت لەنێو گژوگیا ئاساییەکانو درکە دڕندەکاندا چەند

درەختێك باڵا دەکەن، بەرەو خۆیان پەلکێشم دەکەن وەك ئەوەی جاری یەکەمم بێت بیانبینم.. گیانم لێی نزیك دەبێتەوەو ئارەزوویەکی بەهێز وامڵێدەکا پێی بگەمو لەژێر سێبەرەکانیاندا پاڵی لێبدەمەوە، بۆ چەند



ساتێك خۆم لەئاگری بەتینی ئەو خۆرەو تیرەكانی بپارێزم كە بەرەو رووم دێن. بەڵام لەبەر سەختیی بێئومێدیو بێتاقەتیم توانام نییە جەستەی كون كونو شەلاڵی خوێنو ئازارم بەرز بكەمەوە.. بە سنگە خشكێ دەڕۆم بۆ لای درەختەكانو، هەندێ جاریش لەسەر پشت، جەنگەڵە وشك هەڵاتووەكە پان دەكەمەوە. ڕێگا بەسەختیی دەبڕم.. گوێ بەهیچ شتێك نادەم. لێی نزیك دەبمەوەو توشی سەرسوڕمان دەبمو هاوار دەكەم: چ درەختێكی سەیرە ؟ چ جۆرێكە ؟! سەوزێكی تۆخەو، گەڵاكانی وردو چڕن، سەرەتا وا هەستدەكەی درەختی زەیتونە بەڵام بەرەكەی كە بەناو گەڵاكانیدا شۆڕبۆتەوە وا دەریدەخات كە درەختی زەیتون نییە، چونكە وا باوە دەنكە زەیتون ئەو قابارەیەی نیە. كەتەماشای هێشوی شۆڕبووەوەی بەری ئەو درەختەم دەكرد، یان ڕاستتر ئەو بەرەم دەكرد كە وەك هێشوی شۆڕبووەوە وابوو. لە دڵی خۆمدا دەموت ئەو درەختە دارمێوە. بەڵام لەبەرئەوەی دەنكەكانی زۆر رەق بوونو دڕێژكۆڵە بوون لەدڵی خۆمدا پەشیمان دەبوومەوەو دەموت نەخێر درەختی بەڕووە .. بەڵێ هەر دەبێ درەختی بەڕوو بێت .. لەدڵی خۆمدا ئەم قسەیەم دووبارە دەكردەوە بۆ ئەوەی ئەو خانەگومانییە لەخۆم دەربكەم. بەڵام سەرلەنوێ بێئاگایی خۆم دەسەلماند: خودایە ئەم درەختە سیحرلێكراوانە چین ؟ بۆچی ئاوا دەگۆڕێنو لەسەر حاڵەتێك ناگیرسێنەوە تا دڵنیا بیم لەو زانیارییەی پێی دەگەم ؟ .. بۆچی دەنكە درێژكۆڵەكانی بەرەكەی كورت دەبنەوەو، خڕدەبنەوە.. تا وەك گوێزیان لێدێت .. نا .. نا.. بەدڵنیاییەوە ئەوە درەختی گوێزە. بەرەكانی شۆڕبوونەتەوە.. بەهێشوو .. بەدانە سەوزییەكەی دەبریسكێتەوە هەندێ جار تۆخەو، هەندێ جار كاڵە. بەتایبەتی كە تیشكی خۆر بەنێو گەڵاكانیدا دەگوزەرێ. بەڵام .. ئاخر دەبێ هەر یەكێك لەم درەختە سەیرو سەمەرانە چوار درەخت بێ لەیەك كاتدا . دەنا چۆن تەنها درەختێك چوار جۆری جیاواز بەردەگرێ ؟!

لەناكاو .. پێشهاتی لەناكاویش زۆرە.. هەندێ جاریش خۆشە .. ئارامییەكی خۆشو فێنك .. وەك شەماڵێكی وەرزی زستان لەگەرمیی تەمووزدا ڕۆدەچێتە نێو ڕۆحی تاوسەندووم.. دەستو پەنجەی وەنەوزێكی فریشتەیی بەسۆزێكی گەرمەوە پێڵوی چاوم لێكدەنێ .. دەنووم چ نوستنێ ؟! لەناكاو رادەپەڕم .. نوستن مانای چییە ؟ ئایا ئێستا من لە خەودا نیم ؟ ئەگەر من نەخەوتوم ئەی ئێستا چۆن خەون دەبینم ؟ بەڵام ئایا من بەڕاستی خەون دەبینم ؟ یان ئەوەی كە دەیبینم واقعەو .. من ئێستا بێدارم ؟ بەڵام ئایا مرۆڤی بێدار خەون دەبینێ ؟ ئایا مرۆڤی نوستو دەتوانێ خەون ببینێ بەوەی كە ئەو خەون دەبینێ .. ئای .. ئای چ ئاستەمە ئەم شتانە !! چۆن حەقیقەت لەوەهمو، واقع لە خەون جیابكەمەوە؟ بەڵام ئەم هەموو پرسیارانەی كە بەچەكوش دەكێشرێ بەتەوقی سەرتاو خەو لەچاوت دەتۆرێنێ بۆ ..؟ چێژ لەخەو ببینە ئەی گەمژە.. تەنها نوستن لەدەریای ترسو ئاسمانی وەهم رزگارت دەكا.. باوەشی پێدابكەو، ڕێمەدە دەربازی ببێ. لەخەودا بمێنەوە.. ڕۆبچۆ بەناخیدا.. بنو .. بنو.. ڕۆژێك بەئاگا دێیتو

دەبینی ئازارو گومانەكانت لێداماڵراوە . ئازایەتی ڕۆچۆتە ناختو هەموو دەروونی ڕاڕای تۆی پڕكردووە.. چاوت لێك بنێ .. بەتەواوی لێكیان بنێ.. بەڵام ئایا چاوم كراوەیە تا لێكیان بنێم؟ بەسە .. بەسە .. واز بێنە لەم پرسیارانەی كە بەهیچ ناتگەیەنێ جگە لە گێلیی زیاترو ئازاری زیاتر . تەسلیم دەبم پێڵوم لێكدەنێم .. بەڵام فرۆل لەناو چاومدا وەك مشتێك خوێی نەرمی لێدێت، ئیتر ئاستەم دەبێ بتوانم بەشێك لەزەمەن دابچڕمو تیایدا چاوەكانم بەداخراوی بهێڵمەوە، چاوەكانم بەتەواوی دەكەمەوە.. ئەو گردەی لەسەری وەستاوم دەكەوێتە لەرزینو ون دەبێ .. هەروەكو ئەوەی گردەكەی پێشو نەبێت .. بەڵكو دەبێت بەپارچە زەوییەكی ئاسایی و وەك جاران لێی ناترسم، نزیكتر دەبێتەوە لەڕۆحم .. زیاتر لەو قەڵا گەورەیەی ناوەڕاستی شارە خۆشەویستەكەم (كەركوك) دەچێ كە لەدێرزەمانەوە پایەدارە.. خانووە بچوكو ناسكو نەرمەكانی، كە بەناو جەستەو ڕۆحی یەكتردا ڕۆچوونو تێكەڵ بوون.. بەشێوەیەك خۆشەویستیو پەیوەندیی لەنێوانیاندا هەیە كە جیهان پێویستی بەلانی كەمی ئەو خۆشەویستیو پەیوەندییە یە

بەڕوونی گەڕەكە تەنگەبەرەكان دەبینم كەلە خانوبەرەكان ئاڵاونو لەپەنایاندا ئەو جۆگەلە بەرزو درێژانە دەبینم كە ئاو وەكو زنجیرو ملوانكەی زیوین بەناویانداو، بەدەوری خۆیدا، گوزەردەكاو تێدەپەڕێ.

بۆ ئەوەی ئەو وەسوەسە دزێوانە ڕەتكەمەوە كە بەدگومانم دەكا بە دڵنیاییەكی زۆرەوە بەخۆم دەڵێم: ئەوە خودی قەڵاكەیە، ئەو قەڵایەی كە وەكو ناولەپی خۆم دەیناسم. دەیناسم بەهەموو نهێنییەكانییەوە.. بەهەموو كۆڵانە ڕێكو پێچاوپێچەكانیەوە.. هەموو ماڵە ئاوەدانو وێرانەكانیەوە.. هەموو ئەو خانوانەی كە داڕوخاون یان خەریكە دادەڕوخێنو چۆڵكراون.. تەنها لەبەر ئەوە چۆڵكراون كە خەریكەدادەڕوخێن.. لەبەر هیچ هۆیەكی ترنا !! كەس خانویەك چۆڵ ناكا كە پێتەوبێتو ترسی داڕوخانی نەبێت .. هەرگیز .. بەڵام ئەو كاتە چۆڵی دەكا یا بوونی ڕەتدەكاتەوە یا بوونی خۆی بەرامبەر ئەو ڕەتدەكاتەوە كە چەند بەشێكی دارمابێتو، لەتواناشیدا نەبێت چاكی بكاتەوە، یا سەرلەنوێ بنیاتی بنێتەوە. ئایا وا نیە؟! وانیە؟ وانیە؟ زۆر جار لەچاوەڕوانی خۆشەویستەكەمدا پەنام هێناوە بۆ ئەم شوێنە چۆڵو وێرانانە . زۆر جاریش هاوڕێكانم لەچاوەڕوانی خۆشەویستەكانیاندا پەنایان هێناوە بۆ ئەم شوێنانە، بەڵام نە من ئەوانم بینیوە نەئەوانیش منیان بینیوە لەكاتێكدا من چاك دەزانم ئەوان لەپشت هەموو دیوارێكی داڕوخاو و هەموو دەرگایەكی ڕزیوەوەن.. ئەوانیش چاك دەزانن لە شوێنێكی ئاشكرادا خۆم شاردۆتەوە.. بەڵام ئێمە بە منداڵی تێگەیشتنێكمان بۆ سوارچاكی هەبوو، یەكێك لە ماناكانی ئەوەبوو كە هەڵسوكەوتو ڕەفتارێك نەكەین كەسانی تر تەریق بكەینەوە.. ئەم وێرانانە.. هەمووشمان دەزانین بوو بووە خاكێكی بەپیتی لاوێتی و ئەویندارى.. ئەو ژوانانەی نوێ دەبوونەوە.. بەڵام هەموویان بێگوناه نەبوون پێویستمان بە شارەزاییەكی عەمەلی هەبوو لەكاروباری ژیاندا، وەكو شارەزایی ئەوانەی لەئێمە گەورەتر بوون كاتێك لەگەڵ ڕەگەزەكەی تردا دەچوونە پەناو پاسارەكان، واتە

لەگەڵ ئەو كیژۆڵانەدا كە تەمەنیان لەتەمەنی گوڵێكی پشكوتوودا بوو بۆ ژیانو عەشق. ئەمانبردن زۆرجار بە ڕەزامەندیی خۆیان، هەندێ جاریش زۆرمان لێدەكردنو بەهۆی كورتیی وەختەوە بە ناپەدڵی دەهاتن . ئەو كاتانە هەرچەند كورت خایەن بوون بەڵام كەسێكی هێندە پڕ لەنیگەرانیو ترسو دڵەڕاوكێ بوو كە لەڕۆژگارێكی دوور و درێژدا جێی نەدەبۆوە. پەلكێشمان دەكردنو بەزۆر دەمانبردن هەندێ جار ڕەزامەندییەكی تێكەڵ لەناڕەزاییان نیشان دەداو، هەندێ جاریش خۆیان ڕادەپسكاندو لەناخیشدا ڕازی بوون، دەمانبردن بۆ ئەو شوێنە چۆڵانەی كە مرۆڤو باڵندەی لێ نەبوو.. بەڵام پڕ بوو لە پشیلەو شەمشەمەكوێرە، دوور لە چاوی كەسوكارو ڕەقیبو حەسودەكان . بۆ ئەوەی كەشێكی لەبار بۆ خەڵوەتە كورتەكان بەدی بێنین.. كەبەدەگمەن لەچەند دەقیقەیەك زیاتری دەخایاند .. ئەوەیشی رووی دەدا بریتی بوو لە بەریەككەوتنی دوودەست یا گوشینی دەستێكی نەرمو لەرزۆك لە دەستێكدا كە هەروەكو ئەو لەرزۆك بوو بەڵام لەو زبرترو هێندەی ئەو نەرمو گەرم نەبوو.. دواتر موچڕكەیەك هەموو لەشمانی دادەگرت، هەر لەتەوقی سەرەوە تا پەنجەی پێ .. ئیتر ئەو موچڕكە یەزدانیيە پڕ نەشوەیە هەموو قەوارەی جەستەی دەبزواند.. وەك چۆلەكەیەكی تەڕو سەرما بردوو دەیلەرزاندین تا سەر مۆخ . بەڵام ئەگەر كات بەشی دوو عاشقەكەی نەكردایە كە زۆرجار ڕووی دەدا.. واتە ئەو كاتەی كە سەرمەدیو بێ كۆتایی بوون گەر تەسك ببونایەتەوە دەبوو دەرفەت بقۆزدرێتەوەو بەفیڕۆ نەدرێ، دەبوو پڕ بكرێ لە كاتی هەڵاتوو، چەند چركەیەكی كورتی لێ مژمیا بكرێ. كات چەندەم كورت بێتو تەسك ببێتەوە بەشی وەرگرتنو بەخشینی كاغەزێكی پەمەیی دەكا كە بەرەنگی دڵ بۆیە كرابێتو هێندەی گوڵێكی رازقی بێتو، بەسەر هەستو سۆزێكی منداڵانەدا پێچرابێتەوە، ئەو كاغەزەی كە هەرچەند ڕووبەرەكەی بچوكە بەڵام هێندەی ئاسمان بەرینو فراوانە كاتێ لەسەر عەرشی دڵی ئەویتر لەنگەر دەگرێ. زۆرجاریش لێوارەكانیان بەئاگری خۆشەویستی سووتاوەو، نەخشو نیگاری وەك تیرودڵو كۆترێك كەنامەی خۆشەویستی هەڵگرتووە تیا نەخشێندراوە. یان ڕازاوەتەوە بەو وشەو رستانەی كە بەزمانێكی گەرمو دوور لە هەموو یاساو ڕێزمانێك نوسراوە. وشەو رستەی گۆرانیيە باوەكان.. شیعرە كۆنو تازەكان.. فۆلكلۆریو هاوچەرخەكان كە زۆر جار لەماناو مەبەستەكانی نەدەگەیشتین.

گەر زەمانە ڕەحمی بكردایەو بۆ ماوەیەكی كورت بێ ئاگابوایە یا خۆی لێمان غافل كردایە، كە ئەوەش ڕوونەداو گەر ڕوویشبدا وەك ئەوەیە كەسێك مەلە نەزانێتو لەگێژاوی دەریایەكی قوڵ دەربازی ببێ.. لەو كاتانەدا كە غیرەت خۆی لەكۆتو بەندەكان دەرباز دەكردو سنورەكانی مەحاڵی دەبەزاندو دەیڕوشاند.. هێندە بەس بوو كە ناكاو ماچێكی سەركوڵمی خۆشەویستەكەت بدزی. بەڵام نازانم بۆچی ئەو ماچە دزراوەی من هەمیشە نیشانەكەی بەهەڵە دەپێكاو بەسەر ناوچەوانەوە.. یا چەناگە.. یا لووتەوە دەنیشتەوە. هەرگیز نیشانەی تەواوی خۆی نەدەپێكاو لەسەر لێوەكانی یان كوڵمە ئاڵەكانی نەدەنیشتەوە.



ڕەنگە هۆکاری ئەو بە هەڵە پێکانە ئەو شڵەژانە بوو بێت کە هەموو گیانی دەگرتەوە.. هەر لە تەوقی سەرمەوە تا دوا گەردی پێ ی پەتیم. یان ئەو موچڕکە یەزدانی یە بوو بێت کە لەیەکەمین پەنجەلێخشان و دەست لێخشانەوە بەدەمارەکانی لەش و هەموو ئەو شوێنانەی گیانمدا بڵاو دەبۆوە کەبەر شوێنێکی ئەو لەشە لوس و لەرزۆکەی ئەو دەکەوت. بەڵام سەرەڕای ئەو پەشۆکان و ورە بەردانە، ئەو ماچە زۆر بەتام بوو.. وای لێدەکردم بۆ چەند ڕۆژێك، هەندێ جار بۆ چەند هەفتەیەك، بە یادی ئەو ماچەوە بژیم، کە تامی لەخەیاڵمدا هێندە ڕازاوەو بۆن خۆش بوو هەستی لەخۆڕازیبونی پێ دەبەخشیم زیاتر لە خۆڕازی بوونی ئەو تاوسەی کە بەپەڕە ڕەنگاو ڕەنگەکانی و بەو جوانی یەی هیچ بوونەوەرێکی تر نیەتی بەشانازییەوە خۆی نمایش دەکا.

خەیاڵم ڕەها دەبوو، دەفڕی، بەباڵەکانی نیگاری دەکێشاو چەندین جیهانی لەخۆشنوودی و کامەرانی بنیات دەنا.. دەبووم بە تاقە سوارچاك کە خاوەنی ئەو سیفەتە دەگمەنانەم تەنانەت.. تەنانەت.. لەو کاتەدا پێکەنینێکی شەرم ئامێز یا قاقایەك لە یەکێکیانەوە بە گاڵتەپێکردنەوە، هەندێ جاریش بەسەرزەنشتەوە، بەئاگای دێنامەوە.. ماچێك ؟ تەنها ماچێك ؟.. لەسەر لوتیش ؟؟ هە هە هە ها- ئیتر زمانم دەبزڕکا.. وشەکانم لەیاددەچۆوە.. چی لەوەزیاتر..؟ لە.. هێن.. وەڵامی بەرامبەر ئەو شانازی و لەخۆڕازیبوونەی دادەمرکاندمەوە کە خەباتی بێهودەم دەکرد لەپێناو هێشتنەوەی دا.. ئیتر لەسەر زەوی ڕادەکشام و.. لەناو گڵەکەدا تەپاوتلم دەدا.. دواتر.. لەخۆم دەپرسی کێ ڕەحمەت و دیارییەکی هێندە گرنگ لە ئاسمانێکی چرووکەوە بەفیڕۆ دەدا..



دەرفەتی خەلوەتێکت بۆ ڕەخسا، بەماچێك، تەنها ماچێك ڕازی بووی ؟ لەسەر كوێنش.. لەسەر لووت.. ئای قورت بەسەر. سەرم دادەتەواندو بە تێكشكان و شەرمێكی زۆرەوە خۆم دەخواردەوە.. لەو چركەیەدا كەبەچڕی هەستم بە بوونی خۆم دەكرد لەناكاو دەهاتمە دەرێ، بەڵكو فڕێ دەدرامە دەرەوە.. بڕیارم دەدا.. بڕیارێكی گومان ئامێز.. كە لەمەودوا دەرفەتی ئاوا لەدەست نەدەم.. ئەگەر بڕەخسێ.. تەنها بەوەشەوە نەوەستی كە لێوم بەخێرایی بەرلێوەگەرمەكانی بكەوێ، یا نەرمایی گوێچكە ساردەكانمان بەریەكدی بكەوێ و، بەس.

لەناكاو ڕوداوی لەناكاویش زۆرەو، زۆرجاریش دزێوە.. هەست كردن بە ئارامی و ئەمان دەپوكێنێتەوە.. ئەو باڵانەم دەشكێ كەبە ئاسمانی خەیاڵی بەختەوەریدا دەمفڕێنێ.. سەرلەنوێ ترس دامدەگرێتەوە.. ترس لەچی؟ ترس لەشوێن؟ ئایا دەزانم ئەم شوێنە كوێیە؟ ئایا زانین دەستەبەری پوكانەوەی ترس نیە؟ پرسیارەكان دەزرنگێنەوە.. پرسیار لەدوای پرسیار بەشێوەیەكی بەرفراوان لەناخمدا لەدایك دەبن. ئیتر سەرلەنوێ وەڵامەكانم لێ ون دەبێ.. تەنانەت تاقە وەڵامێكیش شك نابەم.. ئیتر خۆم لەجوغزی ئەو پرسیارە لینجانە فڕێ دەدەمە دەرەوە.. لە تەلەزگەی ئەو سروتانە ڕادەكەم كە ترس بەچواردەورمدا دەیچێنێ.. خۆم دەهاوێژمە نێو دەریای یادگاریەكانم كە هەموو هەوڵێكی ئاراستەم دەدەم بۆ ئەوەی بمشواتەوەو شەپۆلەكانی ڕامپێچێ و بمكێشێ بە كەنارەكانیدا.. تەنها .. تەنها بۆ ئەوەی بمبا بۆ شوێنێكی دوور دوور.. بەڵام زۆر نابا دەریاكە نامێنێ و لەهەڵقوڵین دەكەوێ.. بەر بەردێكی تیژ دەكەوم كە تەڵاشەكانی وەك نووكە قەمە تیژن.. ئیتر ترس لەشوێنێكەوە دادەبەزێتە سەرم.. وەك هەڵۆ.. چڕنوكەكانی لە جەستەم گیر دەكا.. خەریكە دەمخنكێنێ.. هەناسە سوارم دەكا.. ئیتر وا هەستدەكەم لێبوومەتەوە. تۆ بڵێی نهێنی ئەم هەموو شتە چی بێ؟ تۆ بڵێی لەو بێدەنگیەدا خۆی حەشار دابێت كە باڵی بەسەر هەموو شتێكدا كێشاوە.. نە دەنگ دێ، نەجوڵە.. نەشنەبایەك دێ و، نەچرپەیەك.. ئایا بێدەنگی بەم شێوەیە ترسناكە؟ بەڵام بۆچی ئەم كش و ماتی یە سەیرە هەموو گەردوونی گرتۆتەوە؟ بۆچی چۆتە سەر دڵی ئەو گەردوونەی كەچیتر لێنادا.. ڕۆحی ئەو گەردوونەی كە چیتر هەناسە نادا. بەشێوەیەكی پانۆرامی تەماشای دەوروبەر دەكەم.. دەرگاكان دەبینم والآن.. پەنجەرەكان كراوەن.. تەنانەت دیوارو بەربەستەكانی تریش وەك دیوارو بەربەست نایەنە بەرچاوم.. وەك ئەوەی هەرگیز ڕۆژێ لەڕۆژان دیوارو بەربەستی مادیی نەبووبن.. سەرەڕای ئەو چەندین تۆنە بەردو خشت و چیمەنتۆو گەچ و شیشەی كەپێی بنیات نراوە.. شەفاف و تەنك دێتە بەرچاوم..





وەك چەند ئاستێکی شووشەبەند .. کەچاو بە ئاسانی دەیبڕێ.. دەیبڕێ تا دوورترین مەودا.. بێ ئەوەی بەرهیچ شتێك بکەوێ، هیچ شتێك، هیچ رەگەزو هیچ جۆرەشتێك. سەرلەنوێ ڕۆدەچمەوە بەناخی خۆمدا.. لەقوڵایی ناخمدا دەپرسم: تۆ بڵێی ڕۆچوون بەرەو ئەوپەڕی تێڕوانین مایەی ترس و بیرکردنەوەیەکی لەم جۆرەبێت.. یان وەهمێکی ڕەش و پێشبینییەکی خوراف ئەوا بێت؟ هەوڵێك بێت لەهەوڵەکانی هەرقل، کە هەر وەکو لە فیلمەکانیدا دەردەکەوێ، بۆ تێکشاندنی ئەو کۆت و زنجیرە ئاسنانەی دەیبەستێتەوە.. یا روخاندنی دیواری ئەو بەندیخانەو قەڵایانەی تیای بەندکراوە.. منیش هەمان هەوڵ دەدەم.. بەڵام بۆ ئازادکردنی خۆم نا لەکۆت و بەندەکان.. بەڵکو تەواو بە پێچەوانەوە.. بۆ بەندکردن و بەستنەوەی ئەو تێڕوانینە ڕەهاو بەلەسەیەم که هەموو سنورێك دەبەزێنێ و لە ئاسمانێکی بێ کەناردا دەفڕێ. هەردوو چاوم توند دەنوقێنم.. بەڵام بۆم دەردەکەوێ، چ شتێکی ترسناکیشم بۆ دەردەکەوێ، چاوم بێ پێڵووە! بەڵام کە پەنجەی لێدەخشێنم هەست دەکەم پێڵوەکانم لەجێگەی خۆیانن. کەواتە چی ڕوویداوە؟ بۆچی ئەرکی خۆیان جێبەجێ ناکەن؟ بۆ ڕێگە دەدەن ببینم و پەردە بەسەر چاومدا نادەن؟ ئایا پێڵوەکانم بوونەتە سلیفۆنی شەفاف؟ چۆن ڕێگە لەم هەموو شت و بوونەوەرە دەرەکیيانە بگرم کە بەرەو چاوم هێرش دەکەن؟ دەسبەجێ وەڵام دەدەمەوە: ئاو لەپم.. خۆ من هێشتا دوو ئاولەپم هەیە کە لەگۆشت و ئێسك و پێستن.. تاریکی دروست دەکەن، مەبەستم ئەوەیە شەفاف نین و

چار نایانبڕیو دەکرێ بینینی خۆمی پێ بشارمەوە.. ئاه نا.. نا.. هەرگیز ناکرێ بڕوابکەم.. ئاستەمە بڕوابێنم.. ترس سەرلەنوێ دامبەگرێ بەدزێوترین شێوە ترس.. سەرلەنوێ ترس.. خەریکە دەمپوکێنێتەوە بۆ ئەوەی ترس ئەمپوکێنێتەوەو.. جۆری من بەرەو لەناوچوون ئەڕوا بەڕەوای دەبینم باوەش بکەم بە ژیاندا.. ژیانێکی بێ ترس.. بیرۆکەیەکم لا گەڵاڵە دەبێ.. شوێنی دەکەومو یە وردی لێی دەکۆڵمەوە تا قەناعەتی پێ دەکەمو تەسلیمی دەبم. بۆچی ترسی خۆم نەبەزێنم؟ واتە بۆچی ترسی خۆم نەترسێنمو.. وای لێنەکەم لەبەردەممدا هەڵەرزێو لەدەستم هەڵبێ.. ئیتر زاتی ئەوە نەکا توخنم بکەوێ.. با هورووژمم بۆ بێنێتو پرم بکا لەخۆی؟ ئیسفنجێکی وشک هەڵدەدەمە نێو دەریای ترسم.. بۆ ئەوەی وشکی بکاتەوەو.. بەبێ هیچ رەحمو بەزەییەک هەڵیمژێو تا دوا دڵۆپی بخواتەوە.. چەوی ژێر دەریای ترسم دەرکەوێو هەموو ئەو بوونەوەرانە لەتینواندا بخنکێن کە بەناوی ترسی من دەژین. دوای کەمێک ئیسفنجەکە تەڕ دەبێت پڕ دەبێ لەناوی ترس.. بارستایی قورس دەبێ.. دەڵێم: زۆر چاکە.. ئەمە مانای ئەوەیە دەتوانێ هەموو ئاوی دەریایە بخواتەوە بەڵام ئاو دوایی نایەتو دەریاش بێ سنوورە.. ئیسفنجەکەش بچکۆلانەو نەرمە. هەر ئاو هەڵدەمژێ.. سات لەدوای سات گەورە دەبێ.. قورس دەبێ تا دەبێتە تەنێکی زۆر گران.. لەقورو بەرد. بەڵکو لە قورقوشمو ئاسنو پۆڵاو مس.. هەموو کانزا قورسەکان.. دەچێتە سەر سینگم.. هەموو وردە کونەکانی پێستم دادەپۆشێ.. تەنگە نەفەسم دەکا.. بێهودە هەوڵدەدەم لەسەر سینگمی لابدەمو ڕزگارم بێ لێی.. فەرمان بەدەستم دەدەم ئەم تەنە خورافی‌یە لەسەر سینگم هەڵگرێو پێش ئەوەی بخنکێم دووری بخاتەوە بەڵام دەستم، هەردوو دەستم. بەهەموو موولولەو دەمارو ئێنۆکو پێستو گۆشتییەوە بووە بەدوو بۆری لەشوشەی شەفاف. تۆ بڵێی تەنها دەستم بەم دەردە چوو بێ.. یان هەموو گیانم؟ ئەگەر هەموو جەستەم وای لێهاتبێ چار چی‌یە؟ دەبێ بەهەر نرخێ بێت نەهێڵم چاوم تەماشای ئەندامەکانی تری جەستەم بکا. بەڵام چۆن؟ مەیلی چاوم بۆ تەماشاکردن هێندە زۆرە مەیلی هەموو فزولیەکانی دنیای پێ ناگاتەوە. دەزانم یە غافڵگیری تەماشای جەستەم دەکاو تێر تێر لێی ورد دەبێتەوە.. ئای سەگینە.. شەرت بێ هەردوو چاوم هەڵکەنم پێش ئەوەی دەسبەکارێن. بێ هیچ دوو دڵییەک فەرمان بەدەستم دەدەم ئەو بیرۆکەیە جێ بەجێ بکا دەستەکانم بەرز دەکەمەوە بەڵام لەنیوەی ڕێدا دەوەستێو ئیمچە ئیفلیج دەبن. پرسیارێکی کتوپڕ دەسەوسانم دەکا.. باشە پاش ئەوەی چاوی خۆم دەرهێنا.. ئایا بەبێ چاو دەژیم؟ ژیان چ مانایەکی هەیە ئەگەر چاو نەبێ؟ ئەم پرسیارە پرسیارێکی ترسناکتر دێنێتە پێشەوە: باشە کەڵکی چاوێک چییە دیوارەکانیش ببڕێ.. هەر وەکو چۆن تیر بەبێ هیچ بەربەستو ڕێگرێک بۆشایی دەبڕێ؟ چی لەچاوێک بکەم وەک چاوی مردووەکانی ژێر گڵ قوڵایی زەوی دەبینێو، لەهیچ ئاستێکدا ناوەستێ؟ بەڵام ئایا چاوی مردووەکان بەم شێوەیەیە؟ ئەم پرسیارە هەموو گیانم دەلەرزێنێو دەسبەجێ وەڵام دەدەمەوە: بەڵێ دەبێ وابێ. ئەگەر نا بۆچی چاوی مردووەکان بەکراوەیی دەمێنێتەوە تا یەکێک لەخۆی دەبووریو دایاندەخاتو پێڵوەکانیان دەداتەوە یە سەریدا. بەڵام من ئەم هەموو راستی‌یە لەکوێوەدەزانم.. تۆ بڵێی ئەمانەڕاستی بن.. یان خورافات بن..؟ من ئەم شتانە لەکوێوە دەزانم لەکاتێکدا من هەرگیز نەمردووم.. تەنانەت بۆ تاقە جارێکیش لەهەموو ژیانمدا کە دەکاتە نیو سەدە زەمەن نەمردووم.. ئای خۆزگەلەگەڵ زانینی ئەم شتانەدا.. بمزانیایە ئیرادەی خۆم راستبکەمەوە، بەڵام منێک کە نازانم.. ئاستەمە راست لەناراست جودا بکەمەوە لەشوێنێکدا لەشوێنە پێچاوپێچەکانی مۆخم کە پڕە لەبیرۆکەو وەسوەسە.. بیرۆکەیەک لەدایک دەبێ بۆ ئەوەی چاوم لەشتێکی تردا تاقیبکەمەوە، تۆ لەوڕۆژەوەی هاتویتە ئەم شوێنە چاودەگێڕی بەسەر دیوارو خانوەکاندا.. بەڵام هەرگیز لەو خاکە ورد نەبویتەتەوە کەلەسەری وەستاوی لەچرکەی لەدایک بوونیەوە لەململانێدایە لەگەڵ فکری کەسانی تردا.. بێ ئەوەی گوێ بدا بەوەی کەتازەنو کەم ئەزموونن. بەرامبەری بیروڕای کۆنو تەڵەزگاوی بۆ دەرباز بوون لە ڕوویەڕووبوونەوەیەک لە ئەنجامەکانی زامن نیە، ڕەنگە لەبەر ئەوەی ترسناک بێت، زۆر ئابا چۆک دادەداو بیرۆکەکەش دەبێتە ئەرکێکی پێویست. دەی.. دەی.. لەزەوی ورد بەرەوە بەڵام ئەوە چۆنە گەرنیگاکانم چینە جیۆلۆجیەکانی زەوی ببڕێو.. قووڵ قووڵ ڕۆبچن بە هەموو ئەو لمو بەردەڵانو ئاو و ئەوتو درەختو ئاژەڵە بە بەردبووانەی وەک دێناسۆرو بوونەوەرەکانی تر.. دواتر بگاتە گەردوونەکانی دیکەو، ئەو هەسارەو مەجەڕانەی تەنانەت گالیلۆش، کە هەمیشە تەماشای ئاسمانی کردووە، نەیبینیوە هیچ میکرۆسکۆپێک یان هیچ تەلسکۆبێکی دوای گالیلۆو دوای دوور بینە گاڵتەجاڕیەکەی درکیان پێنەکردووە.. نا.. نا.. هەرگیز ئەو کارە ناکەم هەر تەماشای ئاسمان دەکەمو لە ئادیار وورد دەبمەوە تەماشای ئاسۆکان دەکەم.. تەنانەت تەلسکۆبی گالیلۆش لەم ڕۆژانەدا کارێکی ئەوتۆ بەرامبەریان ئەنجام نادا، هەر ئەوەت پێشکەش دەکا کە قاوەخانەیەک لەگەڵ پیاڵەیەک چادا پێشکەشی دەکا. بەڵام وەزعەکە شمشێر بە ڕووتدا هەڵدەکێشێ: سەر بلەقێنە بەڕاستدا.. بەچەپدا.. سەیری پێشی خۆت بکە.. وەرچەرخێ بۆ دواوە هەموو ئاراستەکان تاقیبکەرەوە.. قەیدی چی‌یە ئەگەر تاقیبکەیتەوە چی لەدەست دەدەیت؟ خەڵکی بەم ڕۆژگارە لەتاقیگەکانداو لەسروشت و کێڵگە ئەزموونیەکاندا تاقیکردنەوە لەسەر کەسانی‌تر ئەنجام دەدەن. ئیتر تۆ بۆ لەوە دەترسی سەیرێکی ئەو زەویە رەق و تەقە بکەیت دەی تۆ نیگایەک بگرە بەر پێت. دوای گومان و ترسێکی زۆر نیگایەم لێدەکەوێتەوە سەر زەوی. بەڵکو سەرەتا ڕێدەدەم دڵۆپ دڵۆپ بتکێتە سەر زەوی‌و، دواتر بچۆڕێو جۆگەلە ببەستێ، بێ ئەوەی زەوی ببڕێو ڕۆبچێت بەناویدا، هەستم بەتونێلی دەرەوەی کرد کەبە تۆپەڵیی مابۆوە بە ئیرادەی خۆم.. بە ئیرادەی پەتی‌ی کەسایەتی خۆم.. جوڵەم خستە ئاوی هێزێکم دایە تاکو چوارچێوەی ئەو شوێنە دیاریکراوە تێکبشکێنم .ئەوکۆتو زنجیرانە وردوخاش بکەم کە پێوەندی کردوونو بەستونیەتیەوە بە تاقە شوێنێکەوە ئەوە شەقامە قیرتاوە دیواربەندەکەیە کەلەناوقەدی ئەوقەڵایە ئاڵاوە کەلەسەر زەوی قوت بۆتەوە هەروەکو چۆن پشتێنێکی چەرمی شەق بردوو لەشتێک دەئاڵێ پشتێنێک کە زیاتر لە ڕەنگێکی تێدابێتو تەنها ڕەنگێک هەموویان کۆبکاتەوە.. کەشێوەیەک لەدژبوونو ناهارمۆنی کۆدەکاتەوە.. قڵیشێک لێرەو.. کونێک لەوێ.. درزێک لەشوێنێکی‌تر.. هەروەکو ئەوەی گوریسێکی سێدارەی کۆن لەملی پیرەژنێک ئاڵابێت.. ددانەکانی هەڵکێشابێتو، تاڵە قژەکانی هەڵکەندبێ،ئەوەیشی کەمابێ بەسەرکەللەی روتاوەی سەریدا دابەش بووبێتو هەموو عەیبو عەورەتی ژێر پرچەکانی ئاشکرا کردبێ، زیاتر لەو ڕووبەرانەی کەبەشەرمەوە لەچاوانی خەڵک دەشارێتەوە. لەقەراغ ئەوشەقامەو لەدووری تەنها چەند مەترێکەوە، بەتایبەتی لە پێچاوپێچە ئاوساوەکانیدا.. ڕووباری (خاسەسو) بەچاکی دەبینم .ئەو ڕووبارەی کە لە پیاوێکی پیر دەچێ لم لیکی دەمی وشک کردبێتەوە.. تەڕەشوعی تیا نەمابێتو هیچ شتێک جگە لە چەند قڵیشێک بەدی نەکەیت ڕووبارەکە دەمی داچڕیبێت.. وەک تیمساحێکی خوراڤی کەهەزاران بگرە ملیۆنەها ددانی بەردین لە دەمیدا بن، هەندێکیان لەجێی خۆیان بنو هەندێکیان بلەقن.. تا چاو بڕکا بەهەموو ئاڕاستەکاندا بڵاوبووبنەوە، تەپو تۆزو وردە زیخ چواردەوری گرتبێ، قاچە قورسەکانی زەمەن پانی کردبنەوەو وردو خاشی کردبنو بوو بن بەتەپو تۆز.. وەک لمو تەپو تۆزی بیابانەکان و ناوچە وشکەڵانەکان.. ئاه.. چەند سەیرە دەریایەک.. هەر دەریایەک.. بوبێت بە بیابانێکی وشک، تینوێتی شەقار شەقاری کردبێتو، کرمێ بوو بێت، وشترو درکی سوبێریەناویدا بڵاو بووبێتەوە، خۆر لەسەری بمرێتو.. لەتەپۆڵکەکانیدا خوێ لەگۆڕی بنێ، بێ ئەوەی فرمێسکێکی برێژێتو هیچ خەمێ بخواتو دەنگێکی لێوەبێت، بێ ئەوەی تەرمەکەی بنێژرێتو پرسەیەکی بۆ بگیرێت، یا خەڵکی لەرێگەی خوێندنی فاتحەیەکەوە هەستو سۆزی چەپێنراوی خۆیان لەئاوێکی گەرمو سوێردا دابمرکێننەوە.

تا ئاهێک بێتەوە بەریانو تۆزی ئازاری ئەو کارەساتە گەورەیەو ئەو ڕووداوە دڵ تەزێنەیان بڕەوێتەوە.. ئازار بەخشە. زۆر ئازار بەخشە.. کاتێ ڕووبارەکەی خۆم، دوای لێکدابڕانێکی زۆر، ئابەو حاڵە ناهەموارە دەبینمەوە.. پاچی زەمەن چاڵێکی گەورەی کردۆتە نێوان ئەو و مێژووە پڕ سەروەرییەکەی ڕۆژی لە ڕۆژان لەهەرەتی لاوێتیدا بوو، وەک لاوێک هاژەی دەهات، پڕ بوو لە ژیانو چالاکی، دنیای پڕکردبوو لە تریقەو پێکەنین. کەرکوک لەدەنگو هاژە هاژی ئەو بەئاگا دەهات، هەروەکو چۆن کاتی خۆی لەدێر زەماندا (ئارابخا) لەگەڵ بێداربوونەوەدا دەچووە جێ ژوانی ئەو.. تا ئەم دواییەش ژنان گۆزەکانیان لەو خێراوەی ئەو پڕ دەکرد کە نەیدەزانی دوایی هاتن یانی چی؟ لاوانو مێردمناڵان پۆشاکەکانیان لەبەرخۆیان دادەکەندو دەچوونە نێو ئەو ڕووبارەو، ئەویش بە سۆزو خۆشەویستی خۆی دایدەپۆشینو، بەشەپۆلو پەنجە ناسکەکانی لەشیانی دەشێلا.. لەکاتی سازدانی





گەمەو سروتەکانیاندا گیانیانی لە پیسی وتەپوتۆز پاك دەکردەوە نەیدەهێشت باوەشی پڕ لەمیهری جێبێڵن تا ئەو کاتەی تیشکی خۆری بەخشندە لەسەر جەستەی تەڕو ناسکیان دەدرەوشایەوە.. کە بەئەسپاییش دەگەڕانەوە بۆماڵەوە لەگەڵ ڕووبارەکەدا لەژوانی ڕۆژی دواتردا بوون.. ئەوان ماندوو نەدەبوون.. ڕووبارە ئارامو میهرەبانەکەش بێزار نەدەبوو. پەیوەندیی پیاوان لەگەڵ ڕووبارەکەدا لەجۆرێکی تربوو.. پەیوەندی عەشق ڕزق و کاربوو.. بەیانیان زوو دەچوون جۆگەلەکانی ڕووبارەکەیان بەرەلادەکرد.. پەیامی ڕووباریان دەدا بە باڵندەو درەخت و مرۆڤەکان دەرگای جۆگەلەو گولەکانیان دەخستە سەرپشت.. تاکو بەنۆرەیاری لەگەڵ سەوزەو میوەو گوڵ و گوڵزارەکانی ئەمبەرو ئەوبەردا بکەن.. هەندێ جار بەخشندەیی و میهرەبانیی ڕووبارەکە هێندە فراوان دەبوو کەهەموو سنورەکانی دەبەزاند. بەڕۆژ، تەواوی ڕۆژ، هەموو کێڵگە جۆراوجۆرەکانی ئەمبەرو ئەوبەری ئاودەدا، شەوانیش دەهاتەوە یەك و، وازی لێدانیان بۆ ئەوەی بنوون بەلام بەجێی نەدەهێشتن و لەنزیکەوە پاسەوانیی دەکردن.. هەناسەکانیانی بۆنخۆشتر دەکرد. ئاوازی خۆشەویستی بۆ دەژەنین. ئاخ..ئاخ.. ئێستا چۆن پیربووە.. چۆن بەملاولادا پەرتەوازە بووە.. پێویستی بەتوانای ژنە جادووگەریٔهەیە تاکو بەشە پەرتەوازەکانی کۆبکاتەوەو سەرلەنوێ ژیانیان بەبەردا بکاتەوە.. تاکو ڕووبارەکە وەکو جاران وزەو چالاکیی ببەخشێتەوە بەهەموو ڕووەك و بێ گیانەکان. بۆ ئەوەی ئەم حاڵەی ڕووبارەکە نەبینم، کەبووە بەڕووباری زیخ و چەوو ئەو بەردانەی کە بەپیرۆزیی نەماون.. واتە بەهایان لەدەس داوە. لەبازاڕەکانی بۆرسەو شۆرجەدا نافرۆشرێن.. لەباوەڵی ئەمانەتیەکاندا لە بانکەکاندا نایانپارێزن.. هیچ ژنێك لەژنە شۆخ و ئاساییەکان نایکەنە ملوانکەو گەردنی پێ نارازێننەوە. شەقامەکە.. هەمان شەقامە دیواربەندەکەیە.. کەچەندین جار بەپێ کێلاومن.. بەسەریدا هاتووم و ڕۆیشتوم ئێستا ئەو شەقامە نیە کەمن ناسیومە، چۆڵ و هۆڵە.. تەختە.. نە ئینسانی لێیەو نەجنۆکە.. نەبنیادەمی لێیەو نەئاژەڵ.. نەباڵندەو نە درەخت.. نەخۆرو نەمانگ. کاتێ بەسەر شەقامەکەدا هەنگاوم دەنا خۆر هاتبوە بەرپێم، لەگەڵ هەموو هەنگاوێکدا خەریك بوو پێم لێدەنا..لەناوەڕاستی حەشامەتێکدا.. کەنەمدەزانی چۆن پەیدا دەبن و بەرەو کوێ دەڕۆن.. دەمبینی خۆیان دوای سێبەرەکانی خۆیان کەوتبوون کە خۆر لەبەر پێیاندا یا لەسەر شانی هاوەڵەکانیان کە لەپێشیانەوە بوون دروستی کردبوو.. ئەو سێبەرانە هێندە ڕەش بوون وەك ئەوەبوو تازە لەتەنورێکی بەتینەوە هاتبنە دەرەوە. شەوان..ئەو دیمەنە نەدەگۆڕا هەرهێندە بوو ئەو حەشامەتە دەهاتەوە یەك و سێبەرەکان بەهۆی تریفەی مانگەوە لەپاش و پێشی خەڵکەکەوە لەڕووبەرێکی فراوانتردا دروست دەبوو.

ئەوەی بەشەودا دەڕوا سێبەرەکەی بەشێوەیەکی جیاواز لە خۆی دەبینێ، وا دەزانێ لەهۆڵێکی ئاوێنە بەنددایە کەوێنەی ڕاستەقینەی تێدا ون بووە.. بەلام تەمەنی شەو لەم شەقامەدا لەتەمەنی شەوانی هەر پارچەیەك لەپارچەکانی جیهان کورتترە، وەك کورتخایەنیی کزەیەکی سارد لە ئاووهەوایەکی گەرمدا.. هاتوچۆی بەردەوامی ئۆتۆمبێلە بەلەسەکان و هاتوچۆی پچڕپچڕی ئەو قاچانەی کەبەدوای پارویەکدا دەگەڕێن بۆ دەمی ئەو کەسانەی کەهەڵیانگرتوون یا ئەوکەسانەی کە لاوازیی و نەخۆشی وخەو کۆت و بەندی کردوون ئەو شەوگارانە پارچەپارچەدەکا. بەپەنا یا لە پێش و لەپاش ئەو گالیسکانەدا دەڕۆن کەچەند ئەسپێکی لاوازو ڕووتەڵە. ڕایاندەکێشن.. برسێتی و ماندوێتی و قامچی پێکەوە کۆدەبنەوەو گاز لەپشتی ئەو ئەسپانە دەگرن و جێ شوێنی ددانەکانیان جێدەهێڵن.. یانەو مرۆڤانە گالیسکەکان ڕادەکێشن کە حاڵیان لەحاڵی ئەسپەکان باشتر نیە، لەوان لاوازترو ماندووترو، سەعاتەکانی ئیش کردنیشیان لەوان درێژترە. گالیسکەکان خۆیان پان دەکەنەوەو، داروپەردووی یەکتری دەخەنەنەو چاڵانەوەکەبەدرێژایی جادەکە بەملاولادا بلاو بوونەتەوە، هەندێکیان گەورەو هەندێکیان بچوك. کاتێکیش دەسبەرداری قاچە پلاستیکیەکانیان دەبن، پڕ دەبن لەبوونەوەرو دروستکراوی تر بێ وچان و بەشێوەیەکی چالاك، ئاوەستن و دەرقەتێکیش بەخۆیان نابەخشن بۆ ئەوەی چەند هەناسەیەکی خێرا هەڵمژن. بیر لەوە ناکەنەوە پشوویەك بدەن.. بەلام لەم کاتەدا بێدەنگییەك لەو ژیانەجەنجاڵ و غەڵبەغەڵبە



دەناڵێ.. زۆر توندتر لەو حاڵەتەی کەلە قەڵاکۆنەکەی کەرکوک دەناڵێ.. پڕە لەبۆشایی، بۆشاییەک لەو بۆشاییە سەرنج ڕاکێشترە کەبەسەریدا دەڕواو دەچێتە نێو دەمارو مووڵووڵەکانی.. لەکاتی خەوو بێداریدا بەرجەستە دەبێ.. لەناکاو.. ڕووداوی لەناکاویش زۆرەو، کاریگەری زۆریش لەسەر دەروون جێدێڵن. دیمەنی غەڵبە غەڵبو دەنگە دەنگێک.. چەند شتێکی تر کەنازانم.. منو گەردوون پێکەوە دەهەژێنێ.

هەموو شتەکان بەناو یەکترداچوون بەشێوەیەک ئاوی خۆیان لەدەس داوەو چەند ئاوێکی تازەیان وەرگرتووە کەنازانمو.. پێشتریش نەمبیستوون. وشەکان لەدەس هێرشی ئالۆزێکی دەنگەکان ڕادەکەن.. بە شێوەیەک خەریکە دەپوکێنەوە. جگە لەهاوارێک کە لەناخمەوە دێتو پێستێک لەوشە دەپۆشێ: ژیان چووەوە بەبەری جەستە مردووەکەدا، لەو دەریایەدا کەدەریای بەردەکان بوو.

ژیان ژیایەوە.. بەغەڵبە غەڵبێکی زۆرەوە کە گوێ کەڕ دەکاو بەر ئەقڵ دەکەوێ. بەشێوەیەک تەنانەت بەهەشتیش دەهەژێنێ. چ کانیاوێکی یەزدانی لەئاسمانەوە هەڵقوڵا. غەزەبی هەموو خواوەندەکانی ڕژایە نێو دەریا پیرەکەوە. ئاو هەڵقوڵا وەک شێتێتی ئەو حاڵەتە. بەڵام ئەمە چییە؟ ئەوەی لەئاسمان

جیادەبێتەوەو لەزەوی هەڵدەقوڵێ‌و هەردوو کەنارەکە پڕدەکا.. ئاونیە! بەڵکو بەردە.. چەند بەردێکی لووس کە بەئاوێك شۆردراونەتەوە لەهیچ شوێنێك بوونی نیە.. نا.. نا گلۆر نابنەوە وەکو بەرد.. بەڵکو وەکو ئاو دەڕۆن دەڕۆن.

هەزاران بەرد.. میلۆنەها.. ملیارەها بەرد بەبارستایی جیاوازو خێرایی جیاواز بەڕێوەن، هەندێکیان گەورەن‌و وەکو کەفوکوڵی لاوان خێران.. هەندێکیان بچوکن‌و ورد ورد دەڕۆن تاکو بگەنەوە بەگەورەکان.. هەندێکیان لەوکەلێن‌و بۆشاییانەوە دەڕۆن کەگەورەکان بەجێی دێڵن. هەندێکیشیان بەسەر شان‌و ملدا هەڵدەزنن. هەندێکیشیان باز بەسەر پشتدا دەدەن.. بەڵام بێهودەن. چونکە بەشوێن ئەو بەردانەوەن کە لەگەورە بووندان.. رادەکەن‌و، لەپێشبڕکێدان بەرەو نادیار. لەو پێشبڕکێ سەیرەدا هەندێکیان بەیەکتری پان دەکەنەوەو، هەندێکیان یەکتری وردوخاش دەکەن. بێ ئەوەی گوێ بەجیاوازی قەبارەو تەمەن بدەن، هەر یەکێکیان لەخەمی ئەوەدایە خۆی بەتەنها لەپێشەوە بێت. هەوڵی مەحاڵیش ئەدەن بۆ بەدەستهێنانی ئەو پێگەیە.لەکاتێکدا هەموو یاساکانی ئەم دنیایە، ڕەنگە دنیاکەی تریش، بڕیاریان لەسەر ئەوەداوە کەدەبێ هەندێك لەپێشەوە هەندێك لەدواوەبن.

سەبارەت بەباسکردنی دواوە.. ئارەزوویەك لەناخمدا چەکەرە دەکا بۆ ئەوەی تەماشایەکی ئەو حەشامەتە سەیرە بکەم، ژمارەیەکی زۆر بەرد دەبینم کەقەبارەیان گەورەیە..زۆر بەزەبرن.. هیچ لێبووردنێك نازانن..بەرەو پێشەوە دەچن.. بەریەکتری دەکەون..دوابڕیاریان داوە کەدەبێ پێشی بەردەکانی پێش خۆیان بکەون، تێیان پەڕێنن‌و، بیانگەڕێننەوە بۆ دواوە.. پانیشیان بکەنەوەو بەسەر تەرمەکانیاندا بڕۆن ئەگەر رازی نەبن مل بدەن.. ئیترلەگەڵیاندا دەچنە ململانێیەکی سەختەوە.. بەهەموو هێزێکەوە گورزیان تێدەسرەوێنن. بەردەکان بەبەردەوامی لەسەرچاوەیەکەوە هەڵدەقوڵێن شوێنەکەی نادیارە.. هەڵقوڵان‌و رۆیشتن پێکەوە بەردەوامن.. تا رووبارەکە پڕ دەبێ.. تۆبڵێی چی روویدا گەر لافاوی ئاوی رووبارەکە هەستێ.. مەبەستم لافاوی بەردی رووبارەکەیە.

بەردەکان لەسەریەك کۆدەبنەوە.. تەپۆڵکە دروست دەکەن. بنی ڕووبارەکە دیارنەما.. سنورە دیاریکراوەکانی سڕانەوە.. بەرەو شەقامە دیواربەندەکە کەوتە ڕێ.. بەردەکان بەسەر پشتی یەکتریدا سەردەکەون.. دەچنە سەر بالآی یەکتر.. تادەگەنە قەلاکە، منیش وەك تەماشاکەرێك وەستاوم.. دواتر.. لەگەڵ گلۆربوونەوەدا راپێچم دەکاو.. پاشم دەکاتەوە. ئەو گلۆربوونەوەیە تەڕ پێش وشك دسوتێنێ؟..نا ..نا سەرم رادەوەشێنم تاکو ترس لەخۆم دوور بخەمەوە.. وەکو ئەوەی مێش لەخۆم دەرکەم.. مێشێك کە بەدەرزی لێکێندرابێت بە ڕوومەتمەوە.

دەری دەکەم((دەگەڕێتەوە، دەری دەکەم هەر دەگەڕێتەوە.. بەچ شێوازێك شتێك لەخۆم دووربخەمەوە کە لەگیان‌و جەستەدا رەگی داکوتیبی؟ بۆ ئەوەی دێوەزمەی ئەو پرسیارە ترسناکەی کە لەهیچ کەسێ ناترسێ لەخۆم دەرکەم.. لەگەڵ گلۆبوونەوەی بەردەکاندا نوقم دەبم. دەبینم خێرایی بەردەکان دەیان جار زیاتر دەبێ. تەنانەت شێوازو قەبارەی بەردەکان دەگۆڕێن‌و شێوەی چەند بوونەوەرێکی سەیروسەمەرە دەپۆشن شێوەی چەند ئاژەڵێکی دڕندە، کەبرسێتییەکی ئەزەلی راپێچی خوانێکی چەوریان دەکا، لەژێر چاودێری یاسای جەنگەڵ‌و شەریعەت‌و سروتە ئاسمانی‌و زەمینیەکاندا، کە ئەلەئاسمانەوە دابەزیوەو ئەلەسەر زەمینیش بڕیاریان لەسەر دراوە. ئاژەڵەکان لەپێشڕەویدان‌و، پێشبڕکێ لەگەڵ باوك‌و براو دایك‌و منالەکانیشیاندا دەکەن.. تاکو بەو خوانە رابگەن کەهەموو جۆرە خواردنێکی لەسەر رازێنراوەتەوە.

بەڕوویاندا هاواردەکەم: لەسەرخۆ.. بەڕێزان لەسەرخۆ.. ئێوە دواجار بنیادەم نین.. هیچ رەحمێك لەدڵتانا نەماوە.. تەنانەت رەحم بەیەکتریش ناکەن‌و بەزەییتان بەحاڵی یەکتردا نایەتەوە..دەی.. دەی وازبێنن.. وازبێنن ئەی خەڵکینە.. ئەگەرنا!.. ئەگەرنا چی؟ (فیکە) بۆ خۆم لێدەدەم. لەوەزیاتر هیچی ترم لەدەس نایە.. من پارێزگاریی خودی خۆیشم پێناکرێ.. تام لەو فیکە لێدانە دەبینم.. هەمیسان فیکە لێدەدەم.. لەناکاو دەقیژێنم.. وازلە فیکەلێدان دێنم.. ئەوەی کە حەزم لێیەتی‌و هیوای بۆ دەخوازم لەناخمدا دەوەستێ. بەیەقینێکی سەیرەوە دەڵێم. هێندە نابا رەقم لەو یەقینە گێلانەیەی خۆم دەبێ..یەقینێك کە پشت ئەستور نیە بەهیچ کۆڵەکەیەك لە کۆڵەکەکانی زانست‌و مەعریفە کە تۆزێك حەقیقەتی پێببەخشێ، یاماڤێك بەمن ببەخشێ بۆ ئەوەی بەم شێوە شێتانەیە کەهەموو ئاستەکانی گرتۆتەوە ئاشکرای بکەم‌و رایبگەیەنم. بۆئەوەی کۆڵەکەیەکم دەسکەوێ شانی دادەمەسەر.. بۆ ئەوەی بەڵگەیەکم چنگ کەوێ لەم یەقینە بێ هۆدەیە دەربازم کا.. بەملاو لادا دەڕوانم.. نیگام بەسەر پردێکی دوورەوە دەنیشێتەوە.. خۆشحاڵ دەبم.. ئەو ئاواتەم بۆ جێ بەجێ دەکاو دەیگەیەنێتە ئاستی یەقین.دەسبەجێ تەرجەمەی دەکەم بۆ قسەو بەرپردەکە دەکەوێ.. دەوەستێ. پردەکە نزمە.. لەدوورەتر زیاتر بەرز نابێتەوە.. بەڵام دەریا بەردینەکە هەڵدەچێ‌و بەرز دەبێتەوە.. هەڵدەچێ‌و بەرزدەبێتەوە هەروەکو چۆن وشتر

بەکوتی دەرزیدا ناڕوا.. ئەم لافاوە بەردیتە فراوانەش بەژێر ئەو پردەدا ناڕوا کە تەنها چەند دەروازەیەکی لەشێوەی تاقدا تیا دروستکراوە.. وەك ئەوەی تاقی مزگەوتە بچوکەکان بێت. بەلام ئایا ئەم پردە خۆی رادەگری.. ئەم بنیاتە لاوازوپەرپووتە بەرامبەر ئەو لافاوی بەردانە خۆی پێدەگیری؟ دەیڕوخێنێ.. لەگەلْ خۆیدا رایدەمالێ.. دەیکاتە بەشێکی تر لە هێزە شەیتانی‌یەکەی  ئەگەر نەشتوانێ بیڕوخێنێ سواری پشتی دەبێ‌و بەردەوامی بەپێشڕەویی دەدا. بەلام رەوتی رووبارەکە دەوەستێ. ئاه.. هەروەکو پێشبینیم دەکرد لەپەنا پردەکەدا وەستا. هەرچەندە دەبێ ئەنجامێکی لەم بابەتە دڵخۆشم بکات چونکە سەلماندی کە پێشبینیەکانم راستە.. بەلام شەپۆلێك لەخەم و خەفەت داگیرم دەکا، ئەو ترسەم لا دەچێنێ کەپێشتر لام دروست بوو بەوەی کە دەریاکە لێوالێو دەبێ لەناو.. بیون پردەبێ لەبەردو، بەهەردوو کەناردا پەرش دەبێتەوە، شەقامەکە دادەپۆشێ‌و بەرەو ژوور دەڕوا تادەگاتە قەلاکەو منیش لەگەلْ خۆیدا رادەپێچێ  ئیتر ناگەڕێمەوە مەگەر وەك پارووی‌یەکی دەمی ئەو کەسانە بگەڕێمەوە کەبۆ سەر ئەو خوانە سەیرە داوەت کراون‌و.. بەخێرایی بەرەو ڕووی دەڕۆن خێراتر لەمامەلەی فرۆشتنی تاقە خانوەکەمان لەلایەن ئەو باوکەمانەوە کەپێش چەند سالێك بێ مال‌و حالی کردین‌و، هیچ گرنگی‌یەکی بە چارەنوسمان نەدا بەترسەوە گەڕامەوە.. شتێکم شك نەبرد پەنای بۆبەرم. کەوتمە رێ بەرەو دەروازەی قەلا زەبەلاحەکە.. بەو هیوایەی بەسەریدا هەلژێم‌و.. بگەمە لوتکەکەی.. بەیادی ئەو کەشتییەی کەحەزرەتی نوح زۆر بەپەلە دروستی کرد تاخۆی لەتۆفان نەجات بدا. بەم شێوەیە تەنها بەم شێوەیە دەتوانم ژیانم لەفەوتان رزگاربکەم کە لە خانەوردەکانی پێستمەوە دادەچۆڕان‌و، خەریك بوو هەموو گیانمی لێ بەتال دەبۆوە لەماوەی چەند سەعاتێکدا یا چەند دەقیقەیەکی زیاتردا چارەسەرێك بۆ ئەو کارەساتە دەدۆزمەوە کەڕووبەڕووم دەبێتەوە پەنجەکانم لەدەروازکە دەخزێ، چونکە ئەو پایە مەرمەڕەی کەدەرگاکەی لەسەر بەندە زۆر سفت‌و لووسە، وەك شووشە، تەنانەت مێش هەنگێکیشی لەسەر بەنگ نابێ.. ئیتر من چۆن بێ یارمەتی هیچ کەسێك دەستم لێی گیر دەبێ.. بەلام کێ رێ نیشاندەرم دەبێ.. من هیچ بوونەوەرێکی یەزدانی جگە لەچەند بەردێك لەبەردەممدا شك نایەم، بۆ ئەوەی چەند بەردێك کۆبکەمەوە لەسەریەك دایانبنێم‌و، لە ڕێگایانەوە بگەم بەدەرگاکە.  بەلام بەردەکان لووسن. لەسەر یەکتری بەنگ نابن‌و هەلدەخلیسکێن. نای بۆ بەردێکی تیژ.. ژمارەیەك چالْ هەلدەکەنم  بەلام لەکوێ دەستم دەکەوێ

هەموو بەردەکان وەکو تۆپی شوشەیی هاتوونەتەوەیەك. لەچرکەیەکی توڕەبووندا بەشەق‌و بۆکس دەکەوجمە ئەو تۆپانە. بەناسعاندا پەرش دەبنەوەو وەك گولی درکاوی بالادەکەن.. بەلام پارچەکانی شوشەکە لەقاچم دەخشێ. وەك کلو بەفر یان وەکو لۆکەی شیکراوە. هێندە نایا دەبێ بەسکەی پارە هەندێکیان زیوین‌و هەندێکیان زێڕین  لەهەموو شوێنێکەوە بەسەرما دەبارێن. پاش تۆزێك بەچواردەورمدا کەلەکە دەبن، هەستدەکەم لەدەریایەك سکەی پارەدا نوقم بووم. شەپۆلەکانی دەمهێنێ‌و دەمبا تاخەریکە رامدەپسکێنێ  پەنا بۆ شەپۆلێکی بەردین دەبەم.. تا بەتەنها لەگەلْ خۆیدا بمبا.. دەنگی هاژە هاژی رووبارەکە، یان راستر دەنگی تەقەتەق‌و هارەهاری رووبارەکە بەسەر ئەو تریقەو قاقانەی منەدا زالْ دەبێ کەلە قوڕگما پەنگی خواردۆتەوەو نایەتە دەرەوەو ناگاتە گوێ‌ی کەس، ئیتر ئەوە بەدبەختی‌ی منە. لەناکاو.. ڕوداوی لەناکاویش زۆرەو، زۆرجاریش ئازار لەسەر دەرون بەجێ دێلێ.. حالەتی بەردەکان دەگۆڕێ.. شێوەی خۆیان دەگۆڕن یاکەسێك بۆیان دەگۆڕێ.. دەبن بە شتی تر، نە لە دەرەوە نەلەناوەوە لەبەرد ناچن.. زیاتر لەچەند سەرە مەڕێ دەچن کەپۆشاکێکی خوریی پاك‌و سپی‌و سلفتیان پۆشیوە وەك ئەوەی جوان جوان شۆرابن. لەسەر چوارپێ رادەکەن. لەشێوەی چەند مێگەلێکدا دەچنە سەر پردەکەو بەرەو کەناری ئەوبەر دەکەونە پێشبڕکێ‌و پێشڕەویی، هەروەکو ئەو پێشبڕکێ‌یەی جاران کاتێ بەردبوون دەیانکرد، بەلام پێشبڕکێ‌یەکی توندوتیژترە.. هاوچەرخانە ترە.. لەپێناو تەنها چەند سانتیمەترێك جێگادا دەکەونە ململانێ‌ی و قۆچ هاویشتن. قورس بەسەر ئەو مەڕەی دوابکەوێ یا پێ‌ی بخزێ.. دەستبەجێ دەبێتە نیشانەی ئەو قۆچ‌و شاخە تیژانەی کەبە کەللەسەری ئەوانی ترەوەیە. لەوکاتەدا مەڕی پێکراو لەبەردەم تەنها دوورێگادایە.. یادەبێ سەرلەنوێ بەبرینەکانیەوە هەستێتەوەو.. هێز لە برینداریەکەی وەرگرێ.. هەر وەکو دەرفەتی ژیان بۆکەسێ رەخسابێ لەسەر مەرگدابێ‌و.. چوارپەلی بداتە بەر ڕەشەبا.. یان دەبێ تەسلیمی چەند گورزێکی تربێ.. پۆشاکە خاوێنەکەی خەلتانی خوێن ببێ‌و، بکەوێتە سەرزەوی‌و ببێتە ڕێڕەوی پێشبڕکێ‌ی مەڕەکانی ترو.. هیچ ئاسەوارێك‌و بەلگەیەك بۆ بوونی بەجێ نەهێلێ، ئەو بوونەی رۆژێ لەرۆژان واقع بوو، جگە لە پێلاوی خوێناوی هاوڕێ مەڕەکانی تری نەبێ.. ئەو مەڕانەی کەپاش تۆزێ رەنگی پێلاوەکانیان دەگۆڕن بەخوێنی هاوڕێیەکی تریان گەر بووەستێ یان قاچی بترازێ لەپێشبڕکێ‌ی ئەو هەموو مێگەلەدا کەنابێ کەس لەڕێ‌ی خۆی لابدا لە دووری دوورەوە بەرانێکی سەیردەبینم.. شێوەیەکی دەگمەنی هەیە.. بەچوارپەلی خوێناوییەوە بەپچڕپچڕی دەباعێنێ.. بەو خورییەی کەخوێنی لێ دەچۆڕێ ئامارە بۆ لاشەی ئەنجن ئەنجنی مەڕێك دەکا: ئەمە ساناترین سزاو میهرەبانترین نمونەیە.. ئەو کەسانە دەگرێتەوە کە لەڕەوتی بەکۆمەلی مەڕەکان دەردەچن لەم جیهانەی مندا.. دەی.. دەی خێراکەن‌و نەوەستن.. لەجێ‌ی خۆمەوە هاواردەکەم، دەنگم تێکەلی باعەباعی ئەو بەرانە دەبێ کەهاوار دەکا: خێراکەن.. خێراکەن.. خێرا  ئەمە چیە؟تۆبلێ‌ی دواتەمەنم ئەشکەوتێك بێت بۆ دەنگدانەوەی هاوارو فەرمانەکانی بەران؟ بەلام بۆچی نا؟ بۆچوونی بەرانەکە لەسەداسەد راستە.. ئەی بۆچی بەقسەی ئەکەم‌و، هوتافی بۆ ئەکێشم‌و، چەپلەشی بۆ لێئەدەم

ئینجا من ئەگەر پالپشتیان بکەم مانای ترسنۆکی من ناگەیەنێ‌و، هیچ زەرەرێکیشم پێ ناگا.. بەلکو تەنها بەزەییم بەم بوونەوەرە بچوك‌و پاك‌و خاوێنانەدا دێتەوە کە هیچ دەرەتانێکیان نیە.. قەدەرێکی ناخۆش ڕاپێچی نادیاریان دەکا.. هێندە نادیارە کەتەنانەت پێشەنگی ئەو قەدەرەش نازانی بەرەو کوێیان دەبا.. بەلام بەهەرحالْ، لەخراپترین ئەگەریشدا.. لەڕێگە لادان‌و وەستان باشترەو.. لەوە باشترە رێگرێك لەبەردەم رەوتی مەڕەکاندا دروست ببێ‌و.. لافاوی مەڕ هەستێت‌و، لەقەراغ رووبارەکە سەرکەوێ بەرەو شەقامە دیواربەندەکە تادەگاتە قەلاکەو.. بەرزترین شوێنی قەلا.. دەوەستم: خێراکەن.. براکانم خێراکەن.. رامەوەستن.. گەر بوەستن بەحەتمی لەناودەچن.. منیش ڕەنگە لەناوبچم.. رەحمێکم پێبکەن.. رەحمێکم پێبکەن.. هاوارەکانم لەناو هاژە هاژی مەڕەکاندا ون دەبێ بەلێ.. بەلێ.. هاژە.. نەك باعە باع‌و هارمۆنی‌ی رێك‌و پێکی ئەو دەنگانەی لەقوڕگی مەڕەکانەوە دێتە دەرێ. من کوڕە جوتیارم باعەی مەڕ لەنێو هەزاران دەنگدا دەدۆزمەوە.. بەلکو دەتوانم باعەی مەڕ لە باعەی بەرخ جیابکەمەوە.. هەروەکو چۆن دەتوانم هاژەی تاڤگە لەخورەی رووبار جیابکەمەوە.. من هەرچەند هەمووگیانم پڕە لەدەنگی هاژەی ئاو کە لەشاخەوە بەردەبێتەوە.. بەلام تا ئێستا ئەو توانایەم ماوە کە دەنگی خورەی روباری خاسە لەخورەی روبارەکانی دیجلەو فورات‌و خابوورو زاب جیابکەمەوە.. بەلام ئەم هاژە هاژەی دەنگی مەڕەکان کەبەوردی گوێ‌ی بۆ رادەدێرم زۆر سەیر دێتە بەرگوێم، زۆر سەیر کون‌و کەلەبەرەکانی ناوگوێم هەلدەبژێرێ، لەوێشەوە زۆر سەیر رۆدەچێتە ناو هەموو ئەندامەکانی لەشم هەموو ژێیەکانی ناو گیانم دەلەرێنەوە، لەناو ئێسکە پەیکەرمدا کەچەند هەست‌و سۆزی تیایەو چەند توێژالێکی گۆشت دایپۆشیوە دەلەرێتەوە.. لەوە دەچێ بەنیاز بێت هەلیبمژێت‌و بیشارێتەوە.. تاکو نەگاتە بونەوەرە جیاوازو جۆربەجۆرەکانی تر.. لەنێوان خۆیان‌و ئەواندا پردی سۆز بنیات دەنێن.. وەك رارەوێك بەسەریداتێدەپەڕن‌و پشتی پێدەبەستن.. سەرکەوتنیان بۆ دەستەبەر دەکاو ستەمیان لەسەر هەلدەگرێ. بەلام ئەم هاژە هاژە زۆر سەیرە لە بانگەوازی فریاگوزاری پچڕپچڕی ئەو کەشتی‌و پاپۆڕانە دەچێ کەخەریکن نغرۆدەبن. چەند جفرەیەکی تایبەت کەتەنها چەند کەسێکی دیاری کراونەبێ کەس ناتوانێ نهێنیەکانی بکاتەوە لێی تێبگات، ئەو کەسە دیاری کراوانە هیچ مەترسییەك لەسەر رەوتی کاروبارە ئاساییەکان دروست ناکەن‌و بڕیاریان داوە پارێزگاری لێبکەن‌و بەردەوامیی پێبدەن. بانگەوازەکان بەچەقۆی ئازارێك کەبۆنی خوێنی لێدێ پچڕپچڕ کراون.. خەریکە لەناودەچێ.. دلم تێکەلْ دێت.. قڕقێنە دەدەم‌و دەرشێمەوە.. هیچ شتێك لەدەمم نایەتە دەرەوە جگە لە با  با یەك کە گەمارۆدراوە.. لەگەلیدا دەنگێك دێت کەلەدەنگی با خۆی دەچێت.. ئیتر بەدەوری خۆمدا دەسورێمەوە، تاکو دەرفەتێکی راکردن و دەرباز بوون بدۆزمەوە.. کونێك هەموو جەستەمی تێ بترنجێنم، هیچ بۆنێکی پیانەچێتە ژورەوە.. بەلام بێهوودەیە. چونکە بۆن لەبۆشایی‌و لەکونەکانی ئاسمان‌و زەویشدا هەیە. بێئومێدییەکی هەمەلایەنەی زۆر لەناخمدایە. واز لەو خولانەوە بێهودەیە بەدەوری خۆمدا دێنم.. لەهەمان کاتدا ڕێگە بەچاوم نادەم بێهودە لێرەو لەوێ بسورێتەوە تاکو دەربازی ببێ.. لەشوێنی خۆمداو لەچاوەڕوانی چارەنوسی خۆمدا رەق دەبم..

چارەنوسێك كە ئادیارە.. هەموو هەست و سۆزم لەبەرامبەریدا بەچەند وشەیەك بەرجەستە دەبێ.. چی ڕوودەدا باڕوویدا.. چیم لەدەس دێ؟ كەی توانیومە شتێك بكەم.. تەنها شتێك بكەم؟ تەسلیمی بەستەڵەكی كوشندەی پشتگوێ خستن دەبم.. بەڵام من ئەگەر خاوەنی توانایەك بم بۆ ئەوەی جەستەو چارەكانم بخەمە دۆخی بەستن و ڕەق هەڵاتن و بەدەستهێنانی سەركەوتنێك كە پێویستم پێیەتی.. ئەوا ڕاستیەكان هەروەكو دواتریش دەریانخست.. دەیسەلمێنن كە من توانای كۆنترۆڵ كردنی گوێچكەی خۆمم نیە.. خۆم زۆر بێ دەسەڵات دێتە بەرچاو سەبارەت بەوەی ئیرادەی خۆم بكەم بەپارچە تەبەدۆرێك یا كەمێك لۆكەو.. بیئاخنمە هەردووگوێم بیكەمە بەربەرستێك بەڕووی ئەو دەنگانەی هێرشی بۆ دێنن. * لەقوڵاییدا، لەبنی ڕووبارەكەدا.. چەندین دەنگ لەچەندین شوێنەوە دێنە دەرێ.. بەسەر هاژەی ئاو وشەڕەكاندا زاڵ دەبن هاژەو خوڕەی دەنگ و ئاوازی خۆیان گۆڕیوە.. یائاوازو دەنگی سەیرو سەمەرەی تریان خواستوە.. لوورە لوور.. زەڕە زەڕ.. میاومیاو.. حیلە حیل.. قیرە قیڕ.. بۆڕە بۆڕ.. ناڵە ناڵ.. تێكەڵی چەند دەنگێكی تر دەبێ كەناویان نازانم.. سەراپای شارەكە بوو بەجەنگەڵێك كەچەندین جۆر دانیشتوی هەبوو. دارستانێك كە لەشارەكەدا بوو بەئاشكرا ئامادەبوونی خۆی لەڕێگای ئەو هەموو دەنگ و غەڵبە غەڵبە دژیەیەكەوە ڕاگەیاند.

كەئاستەمە پێكەوە لەیەك كات و شوێندا دروست بین.

هەستی بێئومێدی و ترس و بێتوانایی و بێهیواییم لادروست دەبێ.. تێكەڵی ئارەزوویەكی زۆر دەبێ بۆ ژیان.. ئارەزوی ئەوەی بژیم و بەم شێوە كلۆڵە كۆتایی بەبوونم نەیەت و.. لەخۆڕا نەبمە قوربانی دەنگەكان. ئیتر ئیرادەو مەیلم لادروست دەبێ بۆ ئەوەی باوەش بەژیاندا بكەم.. هەوڵێكی تر دەدەم بۆ ئەوەی بەو دەرگایەدا هەڵزنم كە هێشتا لووسەو.. مێشێكیشی لەسەر بەنگ نابێ.. بەڵكو لەجاران لووس تر بوو.. وەك ئەوەی یەكێك بەزەیت چەوری كردبێت. لەگەڵ ئەوەشدا من خۆمی پێدا هەڵدەواسم، وەك ئەوەی ئیعدام كراوێك خۆی بە پەتی قەنارەكەیدا هەڵدەواسێ. بەڵام ئایا ئیعدام كراو خۆی بەپەتی قەنارەدا هەڵدەواسێ؟ ئایا كەڵك وەردەگرێ لەو خۆ پیا هەڵواسینە؟.. كەخۆم بەدەروازەكەدا هەڵدەواسم.. دەروازەی ئەرنجای كۆن.. سەبووریم دێتەبەر. تۆ كە بونەوەرێكی هێندە لاوازیت و.. وەك پەڕێك وایت لەبەردەم گێژەڵوكەدا.. كاتێ باوەش دەكەی بەدەروازیەكی هێندە زەبەلاح و ڕەقدا.. ئارامیت پێ دەبەخشێ.. یاهیچ نەبێ ئارامی بەمن دەبەخشێ و منیش كارم بەسەر خەڵكانی ترەوە نیە.. متمانە لەدەرونمدا دەچێنێ.. ئاواتم تێدا سەقامگیر دەكات بەوەی بەرەو ڕووی ئەو ڕۆژگارو شەوو ڕۆژو كاتانە بڕۆم كە بەڕێوەن. بەو هیوایەی دەرونم بەدەرونم بگاو.. ئاولەپم بەناو لەپەو قامكەكانم بەقامكەكانم بگا.. ترسم دەڕەوێتەوە.. هەست بە تەنیایی ناكەم.. تا لەتوانام دابێت باوەش بەدەروازەكەدا دەكەم.. بەهەموو گیانمەوە داخڵی دەروازە ڕەق و تەقەكە دەبم.. تاقەفەزەی سینگم دەكەوێتە تەقە تەق.. بەڵام بێهودەیە.. گەر هەر پەلێكم پەنجا پەل تری پێوەببەستم.. ناتوانم خۆم لەخودی خۆم ببەخشێنم.. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەستدەكەم دەروازەكە لەباوەشمدا دەكەوێتە لەرزین.. ئایا ئەمە دەچێتە ئەقڵەوە؟ ئایا من دەتوانم دەرگایەكی هێندە زەبەلاح و ڕەق بخەمە لەرزین؟ نا..نا.. مەحاڵە.. ئەوە منم.. ئەوە منم دەلەرزم و.. ئەو موچڕكەیەی هەموو جەستەم دەهەژێنێ و بەدەمارەكانمدا دەڕوا دەمخەڵەتێنێ.. وایپیشانم دەدا ئەو دەرگایەی هێزی زەمانە نەیتوانی بیلەرزێنێ.. ئێستا كەوتۆتە لەرزین.

بەڵام لەراستیدا دەلەرزێ.. ئەم تەنە گەورەیەی كە لەبەردی شوشەیی سفتە دەلەرزێ.. لەگەڵ هەموو لەرینەوەیەكدا هەستدەكەم پەنجەكانم ختوكەی پشتم دەدەن و.. لەچەند شوێنێكەوە پێستم دەگرن.. ئاوڕدەدەمەوەدەبینم كۆمەڵێك باڵ لێم دەئاڵێ.. وەكو باڵەكانی ئەختەبوتێكی نادیار. هەموو هەوڵێك دەخەمە گەڕ بۆ ئەوەی دەرباز بم.. بەڵام ئەو باڵە هیلامی یە زۆرو زەوەندانە.. دەچنە نێو یەك و دەبن بەپرچ وەك گوریسێكی پتەوو درێژ.. لێم دەئاڵێ بەڵام دەروازەكەش شێوازی خۆی دەگۆڕێ.. وەك مانگایەكی گەورەو زەبەلاحی لێدێت هیچ شتێكی لەگوریس ناچێ جگە لە كلكی.. بە بەردەوامی لەجەستەم دەئاڵێ.. خەریكە دەچێتە نێو ئێسكەكانم.. بەچەپ و ڕاستدا ئاوڕ دەدەمەوە.. بۆ بونەوەرێك دەگەڕێم ڕێ نیشاندەرم بێت و.. لەم كلكە سەیرو ترسناكە ئەجاتم بدا.. بەڵام كەس فریام ناكەوێ.. تەنانەت خانووە شوشەییەكانیش كەلەم دیوەوە بۆ ئەو دیو دەبینرا.. وەكو جاران نەماوەو شێوەیەكی سەیری وەرگرتوە.. دەروازەكە دەبۆڕێنێ.. پاش تۆزێك دەكۆكێ و زۆر بە توندی دەپژمێ لەلوتیەوە ئاوێكی ڕەش.. وەكو ئاگر.. ئافوورە دەبەستێ.. پاشان مانگاكە لەشی خۆی دەكێشێتەوە.. پاش كەمێك دووبالی لێدەڕوێ و دەچێتە شێوەی گای باڵداری ئاشوری.. بۆ ئەوەی دڵنیابم لەوەی كەدەیبینم دەست لەگۆشتی شۆڕەوە بووی گاكە دەدەم.. لەوڕگیەوە دەست پێدەكەم.. لەناكاو هاواردەكەم: ئەوە مەمكە.. مەبەستم گوانە.. ئای خوایە كێ گای بینیوە گوانی هەبێ؟ كلكی لێم دەئاڵێ و دەمخاتە بەردەم دووچاو.. لە دوو دەریاچەی خوێن دەچن.. خەڵكانێكی زۆری تێدایە.. یان ڕاستر كەلاكی زۆری تێدایە.. لەپەنا بنیادەمە پەرتەوازەكاندا بوونەوەرێك دەبینم غەڵبەغەڵبێكی زۆری ئاوەتەوەو وەك ئەوەی لەئاهەنگی سەماو گۆرانی و بەزم و سەفادابێت.

لەدەمی مانگاكەوە ڕاخەرێك دێتە دەرەوە كەبەخورییەكی زبر چنراوە. شلەیەكی لینجی پێوەیە.. دەمو چاوم بەو ڕاخەرە دەسڕێ.. دڵم تێكەڵ دێت.. ڕوخسارم خوێن دەتیزێ. ئەو پێستە ناسكەی سەرخوێنە تێزراوەكەی ڕوخسارم شەقار دەبێت. هەروەكو چۆن كاتی خۆی دایكم لەحەمامی ژناندا قاچمی بەو بەردە ڕەشە كون كون و زبرە پاك دەكردەوە كەكەس خۆی لەبەردەمیدا ڕانەدەگرت كاتێ لە پێستی نەرم دەخشا. ڕەنگە ئەو ئاژەڵە هەرچەندە ئاژەڵە.. ڕەحمێكی بەپێستی دەمو چاوی من كردبێت كە خوێنی لێ دەتكێ و.. وازی لە لەستنەوەی ڕوخسارم هێنابێت بەزمانە تیژو زبرەكەی.. ئێستا بەئەسپایی لە پشتم دەدا.. زیاتر بەنیازە متمانەو سۆزم پێببەخشێ نەك ئازارم بدا.. مانگاكە بەئاسماندا بەرز بەرز دەمفڕێنێ.. دوای چەند چركەیەك ڕەشەبایەكی بەهێز هەڵدەكا.. قەڵاكە دەبینم وەكو مقەبا دادەڕوخێ.. یا وەك تەختەیەك لەدێرزەمانەوە كرم تێی دابێت.. خانوەكان دەڕوخێن.. دیوارە بەردین و شوشەییەكانی دەڕوخێن.. بەڵام پاش كەمێك پارچە ئاسن و بەردو چیمەنتۆكان دەبنە چەند بوونەوەرێك كەلە جوڵەجوڵدان.. پۆشاكێكی خوری خوێناوی لەبەردەكەن.. كەواتە پێشبینی یە شومەكەم هاتەدی.. لافاوی ئەو ڕوبارەی كەلە بەردو مەڕو ئاو بوو هەستا.. شەقامە دیواربەندەكەی داپۆشی.. گەیشتە لوتكەی قەڵاكە.. لەكاتی وەستانمدا زۆر ڕێزم بۆ ئەو مانگایە هەبوو كە وەك پەیامبەری چاودێری كردن دەهاتە بەرچاوم.. یەزدان لەخۆشەویستی مندا ناردبووی بۆ ئەوەی لەچارەنوسێكی ڕەش ئەجاتم بدا كە چاوەڕێم دەكرد. لەكاتی خۆیدا هات.. لەكاتێكی زۆر گونجاودا.. بۆ شێوازێك دەگەڕێم كە تەعبیر لەسوپاس و پێزانینی خۆمی پێ بكەم بەرامبەر ئەو مانگایە..هیچ شك نابەم بێجگە لەوەی گوریسەكە ماچ بكەم.. لەگەڵ كلكیدا كە لەسینگم ئاڵاوە مانگاكە زمانم بۆ دەردێنێ بۆ ئەوەی وەڵامی پێزانینی من بداتەوە.. دەیخاتە پێش چاوم.. تەختە ڕەشێك دەبینم.. وەك ئەوانەی كاتی خۆی كەمناڵ بوین لەقوتابخانە بەهاوارەوە شتمان لەسەر دەخوێندەوە.. بێ ئەوەی بیخاتەوە ناودەمی.. یان بیجوڵێنێ.. بەئاوزێكی ئاشكراو زمانێكی ڕەوان پێم دەڵێ: بخوێنەرەوە.. زمانم تەتەڵە دەكاو دەپرسم: ئاخر چی بخوێنمەوە؟ هیچ شتێك لەسەر تەختە ڕەشەكە نەنوسراوە.. سەرلەنوێ قسەكەی دووبارە دەكاتەوە.. بەڵام ئەمجارە وەكو فرمان قایم تر دووبارەی دەكاتەوە: بخوێنەرەوە.. بخوێنەرەوە.. منیش بەوردی تەماشای تەختە ڕەشەكەم دەكەم.. چەند ئەخش و ئیگارێك دەبینم..چەند هێمایەكی سەیر.. لەڕێنوسی مسماری دەچێ.. لەشێوەی ئاگردا كڵپە دەسێنێ.. هاواردەكەم: من ئازانم پیتەكانی خەتی مسماری بكەمەوە.. من..من دەخوێنمەوە: خۆشحاڵین بەئامادەبونتان لەم ئاهەنگەی كەلە سەر شەرەفی ئێوە گێڕامان ئامادەبونتان مایەی شانازی و خۆشحاڵیمان بوو. خۆشحاڵ دەبم و بەزەردەخەنەوە سوپاسی ئەو میواندارییە دەكەم دێوەكە بەخۆشحاڵییەوە.. بەرزبەرز دەمفڕێنێ.. ئاوڕێك بۆ قەڵاكە دەدەمەوە.. دەبینم مەڕەكان بوون بەچەند تۆپەڵە گۆشتێك كەلە بەراز دەچن.. پاسەوانی درەختی زەیتون و بەڕو گوێزو دارمێو دەكەن ئەو ڕووبەرە دەبێ بەبیابانێكی وشك و كاكی بەكاكی..جگە لەدڕك و كاگوڵ و خڕنوك و سوبێر هیچی تری تێدانیە لەبەرزییەوە خەڵك دەبینم وەك مێرو دێتە بەرچاوم كەلەسەر چەند قاچێكی بەرزی دەزوولەیی دەڕۆن لەوانەیە منیش لەبەرچاوی ئەوان وابم.. منیش وەك مێرویەكی بچوك بم كە مێرویەكی گەورە دەیفڕێنێ بەئاسماندا دواتر لەناكاو ڕوداوی لەناكاویش زۆرە و.. و

# محێدین زەنگنە

شێرکۆ بێکەس

ژوورەکەم پڕە لە دیاریی،
لە کۆمێکی "زوریخ"ەوە
چاکەتێکی شینی کاڵم بۆ هاتووەو..
لە تەمێکی لەندەنەوە
کراسێکی خۆڵەمێشیی و
لە شەقامێکی زەیتوونیی پاریسەوە
پانتۆڵێک و
لە باخچەیەکی ئۆسلۆوە
بۆینباخێکی گوڵ گوڵیی.

ژوورەکەم پڕە لە دیاریی.
خۆرنشینێکی هاوڕێم، ڤیەننایی،
قاپێ شەرابی بۆ ناردووم.
لە مۆسکۆوە کرێوەبەفرێکی دۆستم،
جووتێ گۆرەوی ئەستووروو..
زریانێکی قوتبی ژووروو
جووتێ دەستکێش و کڵێتەو..
شەپۆلێکی دەریای سپیش
پەرداخێکی کرستاڵیی.

ژوورەکەم پڕبوو لە دیاریی
بەڵام ئەمڕۆ زۆریم بەخشین
وەختێ لەناو باخی لیمۆو پرتەقاڵی
یافاوە
"با"یەکی نارنجیی هات و
دەستی بەخەنە، لەگەڵ خۆیدا
پڕ بە هۆڵەکانی شانۆ
بۆن و بەرامەی "پرسیار"ی بۆ هێنام و
عەتری قژی چیرۆکێکی کورتەباڵاو
عەتری گەردنی ڕۆمان و
عەتری قەڵەمی زەنگەنە!

سلێمانی

2000/4/19



ژمارەی داهاتوو
تەرخانە بۆ
شاعیر
ئەحمەد هەردی

